منتدى إقرأ الثقافي
للكتب ( كوردى - عربي - فارسي )
www.iqra.ahlamontada.com

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

# نەخۆشییە دەروونییەکان

نوسینی

د. ئەفرام محمد حسن

پسپۆری نە خۆشیە دەرونی و دەماریەکان

چاپی یەکەم ٢٠٠٩

# نەخۆشیەدەرونیەکان


نوسینی

د.ئەفرام محمد حسن

پسپۆڕی نەخۆشیە دەرونی و دەماریەکان



پێداچونەوەی زمانەوانی

لهۆن قادر

ناوی کتێب : نەخۆشیەدەرونیەکان

نوسـیـنـی : د. ئەفرام محمد حـسن

پێداچونەوەی زمانەوانی : لەوَن قادر

دیزاین : ئیبراهیم معروف

نۆرەی چاپ : یەکەم ٢٠٠٩

چاپخانە : تاران _ نشراحسان

ژمارەی سپاردنی ( ١١٤٨ )ی ساڵی ٢٠٠٩ وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

## پێشکەشە

بە مامۆستای مرۆڤایەتی پێغەمبەر درودی خوای لەسەربێت.

بە دایك و باوکم.

بەو مامۆستایانەی لە ماوەی ٢٢ ساڵی خوێندنمدا هەمیشە وەك کۆمەڵە مۆمێك بوون بۆ رۆشنایی و رێنماییم.

بۆ هەر پزیشك و کارمەندێك هەوڵ دەدات لە ئازارەکانی تاك و خێزان کەم کاتەوە.

بۆ هەر کەسێك رۆژێك لە رۆژان هەستی بە نائارامی کردبێت.

بۆ ئەو خێزانانەی ئەندامێکیان نەخۆشی دەرونی هەیە.

بۆ هەر کەسێك ئەم پەرتوکە بە دڵسۆزانە دەخوێنێتەوەو لەرێی تێبینی و بۆچوون و رەخنە بونیادنەرەکانیەوە چاپی ئایندەی ئەم پەرتوکە دەوڵەمەنتر دەکات.

.

ئـەم پەرتوکـە بـە شـێوازێك نوسـراوە نـەخۆش ، کەسـوکاری نـەخۆش ، سـەرجەم تاکـەکانی کۆمـەڵ، خوێنـدکارانی پـە یمانگا و کۆلیـژە پزیـشکیەکان، خوێنـدکارانی خوێنـدنی باڵا، پزیشکەکان لێی سودمەند دەبن.

بـەرێزان دەتـوانن بۆچـوون و رەخنـەکانتان بـەم ناونیشانانە رەوانە بکەن:

١- afram_afram@yahoo.com

منتدى إقرأ الثقافي

للكتب ( كوردى - عربي - فارسي )

www.iqra.ahlamontada.com

# دەستپێك و ڕاستكردنەوەی چەند بۆچونێكی هەڵە

# Introduction and correction of some false ideas

نوسین لە بارەی بابەتە زانستیەكانەوە كارێكی ئاسان نیە بە تایبەتی لەبارەی نەخۆشیە دەرونیەكانەوە كە تا ئێستاش بە نەنگیەك دادەنرێ لە كۆمەڵگەی ئێمەدا. كۆمەڵێكی زۆر وشە و زاراوەی نەشیاو بۆ ئەو كەسانە بەكاردەهێنرێ كە یەكێك یان زیاتر لە نەخۆشیە دەرونیەكانیان هەبێ. وەنەبێ ئەم حاڵەتە تەنها لەنێو كەسانی نەخوێندەوار و لادێ دوور دەستەكاندا هەبێ بەڵكو لە ئاستە بەرزەكانی خوێندن و لە نێو شار و شارۆچكەكانیشدا هەمان حاڵەتی نەزانین هەیە تەنانەت لە نێوان پزیشكەكانیشدا كە پسپۆری بوارەكانی ترن. هەمیشە یان زۆر كات پزیشك و ئەوانەی نەخۆشی دەرونیان هەیە بەشێوەكی نا ئاسایی سەیر دەكرێن.

سەرەڕای هەندێ بۆچونی هەڵە سەبارەت بەم نەخۆشیانە كە گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

١- نەخۆشی دەرونی پەیوەندی بە لاوازی ئیمانەوە هەیە یان ئەوانەی بڕوایان پتەوە كەمتر توشی نەخۆشی دەرونی دەبن.

ئەم بۆچوونە برێك لە ڕاستی و زۆرێك لە هەڵە لە خۆ دەگرێ ئەوەی ئاشكرایە نەخۆشیە دەرونیەكان بە شێوەیەكی گشتی دەكرێن بەدوو بەشەوە ، بەشێكیان بریتیە لە حاڵەتی زوهان یان سایكۆسس كە لە موسلمان و غەیرە دیندا وەكو یەك ڕوودەدات و هیچ توێژینەوەیەك نیە باس لەوە بكات لەو وولاتانەی دانیشتوانەكەی موسڵمانن كەمتر ڕوودەدات. گەر هەندێ توێژینەوەی واش هەبێ هۆكارەكەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئاستی هۆشیاری دەرونی لەم وولاتانەدا لاوازە تاك و خێزان زۆرجار لەبری پزیشك و نەخۆشخانە پەنا دەبەنە بە كەسانێك كە دەكرێ هەر ناوێكیان لێ بنێین جگە لە چارەساز.

جۆری دووەم لە نەخۆشیە دەرونیەكان حاڵەتی نیۆرۆسسە یان ئەعساب كە زیاتر حاڵەتی خەمۆكی و دڵەڕاوكێ هەندێ حاڵەتی تر دەگرێتەوە ڕوودانی ئەمانەش ڕەنگە تا ڕادەیەكی زۆر هەمان ڕێژەی وولاتانی ئەوروپا بێت بەلام لەم

وولاتانەدا خەڵکی لای نەنگیە سەردانی پزیشك بکات و هەمیشە ژمارەی پزیشکەکان زۆر کەمە نەخۆش ناچار دەبێت دەیەها هەندێ جار سەدەها کیلۆمەتر ببرێت تاکو بگاتە لای پزیشك ئەویش بە ماوەیەکی کورت بەبێ بایەخپێدانی پێویست بەرێی دەکات بۆ ماڵەوە لەبەر کەمی کات یان نەبوونی نەخۆشخانەی تایبەت یان هاوکاری نەکردنی کەس کاری نەخۆش بۆ چارەسەر و زۆر جار سەردانی پزیشکی بوارەکانی تر دەکات ، هەوڵ دەدات حاڵەتی نەخۆشەکەیان بە شتێکی تر راڤە بکات جگە لە دەروونی و گەر ئەو پزیشکە رەوانەی پسپۆری دەروونی بکات کە زۆربەیان نایکەن دەڵێ خۆ نەخۆشەکەی ئێمە شێت نیە؟ (

ئەمە گەر سەردانی پزیشك بکەن کە زۆربەیان سەردانی کەسانێك دەکەن بەناوی ئاینەوە چارەسەری خەڵکی دەکەن بە شێوەیەکی ئاشکرا نەخۆش دەروتێننەوە گەلێ شێوازی نەشیاو بەکاردێنن کە نەك لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا شتی وا نیە بەڵکو لە زیندانەکانی دەزگا داپلۆسێنەرەکانی جیهانی سێشدا کاری وا دڕندانەو دوور لە ئینسانیەت هەمیشە روونادات.

لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بەوە بدەین هەندێ نیشانەی نەخۆشیەکان لە کەسانی باوەڕداردا کەمترە وەك لە کەسانی بێباوەڕ، ئەمەش بۆ کاریگەری ئیمان و تێڕوانینی تاك بۆ ژیان و ئایندە دەگەڕێتەوە کە گومانی تێدا نیە کەسانی موسلمان بە شێوەیەکی واقعیانە تر دەروانننە ژیان و شتە بچوکەکان لە خۆ گەورەناکەن و بیرلە خۆکوشتن یان هەوڵی خۆکوشتن نادەن یان زۆر بەکەمی پەنا دەبەنە بەر ئەم رێگەیە سەرەرای ئەوەی لە چارەسەرو خۆگونجاندندا لەگەڵ کێشەکان پەنا نابەنە بەر رێگەی نادروست کە گرفتەکان ئاڵۆزتر دەکات وەکو بەکارهێنانی ئەلکحول مادەهۆشبەرەکان.

٢- پێکهێنانی ژیانی هاوسەری چارەسەرە بۆ زۆربەی نەخۆشیەکان.

بەداخەوە ئەم بۆچونە هەڵەیە لە سەرجەم ئاستەکانی کۆمەڵدا بڵاوە . کاتێك خێزانێك ئەندامێکیان نەخۆش دەبێت هەوڵ دەدەن بشارنەوەو سەردانی پزیشکی پێ نەکەن یان پاش ماوەیەك لە وەرگرتنی چارەسەر کاتێك هەندێك لە نیشانەکانی دیار نامێنێ بەئاسانی ناناسرێتەوە کە نەخۆشی دەروونی هەیە خێرا پەنا دەبەنە

بەر ئەوەی ژنی بۆ بێنن یان بە شووی بدەن بێ ئەوەی بە لایەنی بەرامبەری بڵێن نەخۆشی دەرونی هەیە . بە بۆچونی خۆیان بە ژنهێنان یان شووکردن کێشەکان چارەسەر دەبێ و هەندێجار بۆ لە کۆلکردنەوە خێزانی بۆ دروست دەکەن .

بەداخەوە هەندێ پزیشك کاتێك نەخۆشێك سەردانیان دەکات بە نیشانەکانی حاڵەتەکەی وا دەردەکەوێ کە گرفتێکی کۆمەلایەتی هەبێ زیاتر لە تەندروستی ، هەندێجار گرفتی تەندروستیشی هەیە وەکو حاڵەتی دڵەراوکێ یان خەمۆکی بە کەسوکاری نەخۆش دەڵێن لە ڕستەیەکی گاڵتە ئامێزدا ژنی بۆ بێنن چاکدەبێ ! یان بۆ شوو وا دەکات!

لێرەدا جێ خۆیەتی ئاماژە بە هەندێ ڕاستی بدەین :

- هەرگیز بنەمایی خێزان لە سەر درۆ و فێل لەیەککردن دانەمەزرێ و ئەو خێزانانەی بەو جۆرە دروست دەکرێن تەمەنی بەردەوامیان لەتەمەنی فریودانەکە درێژتر نابێت.
- هەرگیز ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەسەر ئەو فریودانە ڕازی نیە گەر پێغەمبەری ئیسلام بۆ فرۆشیارێك کە کیلۆیەك میوەت بداتێ و لەبری چاکەکە میوەی خراپت بداتێ بلێ ئەوە لە ئێمە نیە واتە لە ڕیزی موسلمانان نیە دەبێ بەرامبەر ئەوە بلێ چی لە بابەتێکی واگرنگدا درۆ دەکات و تاك و خێزانی بەرامبەر فریو دەدات ( پەنا بەخوا ).
- بێگومان ئەم بارە لێرەدا ناوەستێ بەڵکو پاش ماوەیەکی کورت کارەکە دادگای تێدەکەوێت لە بری خێزان دروستکردن دژایەتی لە نێوان دوو بنەماڵەدا دروست دەبێ.
- لێرە حەز دەکەم ڕووداوێکی ڕاستەقینە بگێرمەوە کە ماوەیەك پێش ئێستا نەخۆشێك هاتە لام و گلەیی ئەوەی دەکرد لە هاوسەرەکەی نەخۆشی دەرونی ( سکیزۆفرینیای ) هەیە لە کاتی ژنهێناندا پێیان نەوتووە بەلام لە هەمان کاتدا ئەم بەرێزە خۆیشی نەخۆشی سکیزۆفرینیای هەبوو بە هاوسەرەکەی نەوتبوو ، واتە ئەوەی چاڵێك بۆ برای هەڵکەنێ خۆی تێی دەکەوێ!!

٣- ئەوەی نەخۆشی دەرونی هەیە ناتوانێ ژیانی هاوسەری پێکبهێنێت؟

وەك چۆن كەسانێك هەن لەو باوەڕەدان پێكهێنانی ژیانی هاوسەری چارەسەرە ، كەسانێكیش هەن لەو باوەڕەدان كە ئەوانەی نەخۆشی دەرونیان هەیە دەبێ بیر لەژنهێنان نەكەنەوە ، لە لایەكەوە بە بیانوی ئەوەی ژنهێنان بەرپرسیاریە و بەم كەسانە هەڵناسورێ لە لایەكی ترەوە وای بۆ دەچن منداڵەكانیان توشی هەمان نەخۆشی دەبێ. لێرەدا تەنها وەڵامی بەرپرسیارێتیەكە دەدەینەوە ئەوی تر دەكەینە وەڵامی پرسیارێكی تر.

گومانی تێدا نیە كە پێهێنانی ژیانی هاوسەری بەرپرسیارێتیەو ئەركێكی گرانەو بە هەموو كەس هەڵناسورێ ، گەر باسی ئەوانە بكەین كە نەخۆشی دەرونیان نیە ئایا چەندیان دەتوانێ خێزان دروست بكات یان ئەوانەی دروستیان كردووە چەندیان سەركەوتون لەو پەیوەندیە هاوسەریەدا ، ئەو هەموو تەلاقەی دەدرێت چەندیان نەخۆشی دەرونیان هەیە، دیارە برێكی زۆری ئەو جیابونەوانە بۆ هۆكاری كۆمەلایەتی و ئابوری و پێكەوە نەگونجان و خیانەتی زوجی و .... هتد . دەگەرێتەوە بەلام ئەم هۆكارانە زۆر باس ناكرێ كاتێك یەكێك لە هاوسەرەكان نەخۆشیەكی دەرونی دەبێ ئەوی تریان لەكاتی جیابونەوەدا بە هەموو دنیادا جار دەدات كە هاوسەرەكەی نەخۆشی دەرونی هەبووە بۆیە جیابۆتەوە ، نەگەر وانەبوایە ئەم كەسێكی زۆر باشەو لەگەڵ هەموو كەسێكدا هەڵدەكات و هەوڵ دەدات سۆزوبەزەیی دەوروبەر بۆ خۆی رابكێشت . گومانی تێدا نیە لە كۆمەڵگەیەكی دواكەوتووی وەك ئێمەشدا نەخۆشی دەرونی وەك نەنگیەك یان تەنانەت وەك تاوان سەیر دەكرێ بۆیە دەوروبەر پێی دەڵێن ( دەست خۆش باش بوو خۆت نەجات دا. تەمەنی خۆت لە چیا دەفەوتێنی، لەگەڵ عاقلەكاندا زۆرمان تەواو كردووە جا نۆبەی ...... ) زۆر رستەی بێ سەروبەری تر . ئیتر كەس گوێ لە لایەنی بەرامبەر ناگرێ هەموو كێشەو گرفتەكان دەگەرێننەوە بۆ لایەنی دووەم.

وەك لە وەڵامی پرسیارەكەی پێشودا ووتمان ژیانی هاوسەری لەسەر كۆمەڵێ بنەما دروست دەكرێ ، بەلام بیرمان نەچێ زوربەی ئەوانەی نەخۆشی دەرونیان هەیە و نەخۆشیەكەیان بۆ ماوەیەكی دیاری كراوە دەتوانن ژیانی هاوسەری دروست بكەن و هیچ گرفتیان نیە ، ئەوانەشی نەخۆشیەكانیان درێژ خایەنە دەتوانن لەسەر

بنەماکانی پێشوو بیر لە هاوسەرگیری بکەنەوە. لەهەندێ حاڵەتدا زۆر گرانە ئەو کەسانە بتوانن پرۆسەی هاوسەرگیری بەسەرکەوتووی بە ئەنجام بگەیەنن.

٤- نەخۆشی دەرونی چاکبونەوەی نیە؟

یەکێکی تر لەو بۆچونە هەڵانەی لە کۆمەڵگەی خۆماندا و لەهەندێ شوێنی تری دونیادا هەیە. بێ ئۆمێدیە بەرامبەر بە چاکبونەوەی ئەو کەسەی نەخۆشی دەرونی هەیە ، گومانی تێدا نیە ئەم بۆچونە لە ڕاستیەوە زۆر دوورە . زوربەی زۆری نەخۆشیە دەرونیەکان چاکدەبنەوە و ڕەنگە هەریەکە لە ئێمە لە ژیانی خۆیدا دیەها حاڵەتی وای دیبێ کە کەسێك لە ژیانیدا تەنها بۆ جارێك یان چەند جارێك سەردانی پزیشکی دەرونی کردووە پاشان لە ژیاندا پێویستی بە چارەسەر و ڕێنمایی تر نەبووە. گەر ئەمە بۆ خەڵکی ئاسایی ڕاست بێ لای پزیشکی دەرونی ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگرە کە ئەوانەی نەخۆشی دڵەراوکێ یان خەمۆکی یان ترسی کۆمەڵایەتی یان عەمەلی ( واسواسی ) یان هەیە زوربەیان چاکدەبنەوە. ( سەبارەت بە ئەگەری چاکبونەوەی هەرنەخۆشیەك ، لەگەڵ نەخۆشیەکەدا باسکراوە ).

٥- نەخۆشی دەرونی نەخۆشیەکی بۆ ماوەیە.

زۆرجار لەژێر ئەم ڕستەیەدا ستەمی گەورە لە تاك و خێزان دەکرێ و ستەمەکە تەنها بەتاکی نەخۆشەوە ناوەستێ بەڵکو دەچێتە سنوری خێزان و هەندێجار لەو سنورەش تێپەر دەکات.

کێمان هەیە ئەوەی نەبیستبێ کاتێ یەکێك دەیەوێ ژیانی هاوسەری دروست بکات گەر بنەماڵەی بەرامبەر یەکێکیانە هەبێ نەخۆشی دەرونی هەبێ هەنگاوێ دێتە دواوە خۆ گەر نەخۆشیەکە لە بنەماڵەی کچەکەدا بێ چەند هەنگاوێ دێتە دواوە گەر بەتەواوی پاشەکشە نەکەن لەژێر پەردەی بۆ چوونێکی هەڵەی تردا ( سێ یەکی مندالا لە خاڵوانی دەردەچێ ) .

گومانی تێدا نیە بۆ زۆربەی نەخۆشیە دەرونیەکان بۆ ماوە کاریگەری هەیە بەلام نەك بەو جۆرەی خەڵکی لێی تێگەشتوون ، هەرکەسێ دایکی یان باوکی نەخۆشی دەرونی هەبوو منداڵەکانیشیان توش دەبن.

نەخۆشیە دەرونیەکان بە شێوەکی گشتی دوو هۆکاری هەیە بۆماوە لەگەڵ ژینگە

( لەبەشێکی تردا باسی دەکەین ) ، گومانی تێدا نیە زوربەی توێژینەوە تازەکان ئاماژە بەوە دەکەن گەر یەکێك نەخۆشی دەرونی هەبێ ئەگەری ئەوەی تاکێکی تر لەو ماڵەدا توشی ببێ زیاترە وەك لە کەسێکی تر کە لە بنەماڵەکەیاندا ئەو حاڵەتە نەبێ ، بەلام توشبونەکە حەتمی نیە بەڵکو ئەگەرەکان زیاتر دەکات بۆ نمونە حاڵەتی دڵە راوکی نزیکەی لە ( ٢٪ ) ی هاولاتیان توشی دەبن بەلام گەر یەکێك ئەم حاڵەتەی هەبێ ئەگەر توشبوونی ئەندامانی خێزان نزیکەی لە ( ١٥٪ ) ە. حاڵەتی سکیزۆفرینیا نزیکەی لە ( ١٪ )ی هاولاتیان توشی دەبن گەر یەکێك لە باوان ئەم حاڵەتەی هەبوو ئەگەر توشبونی منداڵەکەیان نزیکەی لە ( ١٠٪ ) دەبێ و گەر هەردوو باوان نەخۆشیەکەیان هەبوو ئەگەرەکە بۆ لە ( ٣٣٪ ) بەرزدەبێتەوە واتە یەك لە سێ نەك لە ( ١٠٠٪ ).

٦- نەخۆشی دەرونی واتە شێتی.

ئەم ڕستەیە خۆی وەلامی خۆی دەداتەوە یان ڕاستر خۆی هەڵەی بۆ چونەکە دەخاتە روو چونکە هەر کاتێ وو تمان نەخۆشی ئیتر شێتی وجودی نامێنێ دیارە هیچ نەخۆشیەکیش نیە ناوی شێتی بێت. شێتی زیاتر ووشەیەکی سەرزارەکیە بۆ دەربڕینی نارەزایی یان نەشیاوی هەندێ ڕەفتار بەکاردێ و لە دونیای زانستدا ئەم ووشەیە بونی نیە ، چونکە هەرحاڵەتێك تۆ پێی دەلێی شێت لە دونیای نەخۆشیە دەرونیەکاندا ناوی خۆی هەیەو وەکو حاڵەتێك ڕەفتاری لەگەڵدا دەکرێ . دەشێ ئەو کەسە نەخۆشی تێکچونی کەسێتی یان حاڵەتی شادی یان سکیزۆفرینیای یان بیرکۆلی هەبێ .

٧- دەرمانەکانی نەخۆشیە دەرونیەکان دەبێ بۆ هەتا هەتایە بەکاربهێنرێ و دەبێتە هۆی ئالوودەبوون( راهاتن ).

ماوەی چارەسەری نەخۆشیە دەرونیەکان لە نەخۆشیەکەوە بۆ نەخۆشیەکی تر دەگۆڕێ ، هەندێ حاڵەت پێویستی بە دەرمان نیە و تەنها بە ڕێنمایی دەرونی چاکدەبێتەوە و هەندێکی تر ڕێنمایی و دەرمانی پێکەوە بۆ بەکاردەهێنرێ بۆ ماوەیەکی دیاری کراو شەش مانگ یان برێك زیاتر و هەندێکی تر تەنها دەرمانی بۆ بەکاردەهێنرێ دیسانەوە بۆ ماوەیەکی دیاری کراو لە زوربەی حاڵەتەکاندا کەمتر لە

ساڵێك و لە هەندێكیاندا بۆ دوو ساڵ، هەندێ حاڵەتی تر چارەسەرەكەی وا دەخوازێ تەزووی كارەبای بۆ بەكاربهێنرێ هاوشان لەگەڵ دەرمان یان چارەسەری دەروونی یان هەردووكیان.

بەلام گەر ئاورێك لە نەخۆشیە جەستەییەكان بدەینەوە ئەوەی پێی دەڵێن نەخۆشیە درێژ خایەنەكان وەكو شەكرە یان بەرزی فشاری خوێن تاك دەبێ هاتاهەتایە دەرمان بخوات و كاریگەری ئەو دەرمانانە لە دەرمانە دەرونیەكان كەمتر نیە.

سەبارەت بەوەی دەرمانەكان دەبێتە هۆی ئالوودەبون برێكی زۆری دەرمانە دەرونیەكان وەكو دژەسایكۆسس (بۆ چارەسەری شادی و سكیزۆفرینیا بەكاردەهێنرێ) یان دژەخەمۆكیەكان ( بۆ چارەسەری خەمۆكی و عەمەلی (واسواسی) و ترسی كۆمەلایەتی .....هتد )بەكاردەهێنرێ یان دەرمانەكانی جێگیركردنی مەزاج (بۆ چارەسەری توندوتیژی كە هاوشان بێت لەگەڵ نەخۆشیەكی دەرونی یان بۆ چارەسەری پەركەم بەكاردەهێنرێ) ئەمانە كە بەشی هەرەزۆری دەرمانەكانی دەرونین نابنە هۆی ئالوودەبوون. پاش ماوەی پێویست لە بەكارهێنان تاك دەتوانێ وازیان لێ بهێنێت بەبێ بوونی نیشانەكانی لێگرتنەوە لە هەندێ حاڵەتدا نیشانەكانی لێگرتنەوە روودەدات بەلام هێندە توند نیەو چارەسەردەكرێ.

ئەو دەرمانانەی كە حاڵەتی ئالوودەبوون دروست دەكەن زیاتر دەرمانەكانی دژەلەراوكێن (كە بۆ حاڵەتی دڵەراوكێ یان بۆ خەواندنی نەخۆش بەكاردەهێنرێ) ئەم گروپە بۆ ماوەیەكی دیاریكراو بەكاردەهێنری كە چەند هەفتەیەك تێپەرناكات چونكە گەر ماوەیەكی لەوە درێژتر بەكارهێنرا وەگەرێ ئالوودەبوون روودەدات ، بەداخەوە تاك زۆرجار لە ئەنجامی ئەوەی لەو ماوەیەكی پزیشك بۆی دیاری دەكات زیاتر دەیخوات توشی ئالودەبوون دەبێت . ئەمە تەنها لە لایەن پزیشكانی دەرونیەوە نیە ئەم گروپی دەرمانە لە لایەن پزیشكان هەناوی و كۆئەندامی دەماریشەوە دەنوسرێ لەوانەیە پزیشكانی دەرونی لە هەموان كەتر بینوسن بە هۆی بوونی دەرمانی تر كە هەمان رۆل دەگێرێ.

یەكێكی تر لەو دەرمانانەی ئەوانەی نەخۆشی دەرونیان هەیە پێی ئالوودەدەبن

حەبی ئارتینە * ، ئەم حەبە بەکاردەهێنرێ بۆ کەمکردنەوەی یان چارەسەرکردنی ئەو زیانە لاوەکیانەی لە ئەنجامی بەکارهێنانی دەرمانەکانی دژەسایکۆسس دەکەونەوە ( ڕەقبوونی ماسولکەکان و ماخۆلان و جوڵەی نائاسایی ماسولکەکانی دەم و چەناکە ) بەڵام گرفتی ئەم حەبە لەوەدایە تاك بە خواردنی هەست بە خۆشی دەکات بۆیە لەو بڕەی کە بۆی دیاری دەکرێ زیاتر دەخوات و هەندێجار دەرمانەکانی نەخۆشییەکە ناخوات تەنها ئەم حەبە بەکاردەهێنێ و بێگومان لەمەشەوە سەردەکێشێ بۆ مادەی تر.

بەکورتی دەتوانین بڵێین زوربەی زۆری دەرمانەکانی دەرونی نابنە هۆی ئالودەبوون ، ئەوبرە کەمەشی دەبنە هۆی ئالودەبوون گەر بە پێی ڕێنماییەکانی پزیشك بەکاربهێنرێ ئەو گرفتە روونادات.

٨- هۆکاری نەخۆشیە دەرونیەکان جنۆکەیە .

تێبینی: لەم کتێبەدا زیاتر لە جارێك ناوی شێخ و مەلا هاتووە زۆرجار بە تەنیشتیەوە لە کەوانەیەکدا نوسراوە بازرگانانی ئاین ، دیارە لێرەدا مەبەست لەو مامۆستا بەرێزانە نیە کە لە مزگەوتەکان پێش نوێژی دەکەن یان ووتاری هەینی دەخوێننەوە یان ئەو کەسانەی نازناویان شێخە یان مەلایە بەڵکو مەبەست لێی ئەو چەند کەسە دەرون نەخۆشەیە کە هەوڵ دەدەن بە ئایەتەکانی خوای گەورەوە بازرگانی بکەن و لافی ئەوە لێدەدەن جنۆکە دەردەکەن و چەندەها نەخۆشی چارەسەر ( چارەشەڕ ) دەکەن.

ئەمە یەکێکی ترە لەو بۆچوونە هەڵەو مەترسیدارانەی لەم کۆمەڵگەیەو کۆمەڵگە دواکەوتومکانی هاوشێوەی ئێمەدا هەیەو بەهۆیەوە کەسانێکی زۆر ئازاردەدرێن و دەیەها کەسیش بازرگانی بەم بۆچونەوە دەکەن و بەناوی ئاینەوە ئاین ناشرین دەکەن و بەنرخێکی کەم ئایەتەکانی خوا دەفرۆشن و بەدنیاکی کورت و براوە ئاینەدەی خۆیان دەفرۆشن بەناوی دینداریەوە دینارداری خۆیان دەکەن و بە بۆچوونی خۆیان وەك چۆن دەتوانن بەندەکانی خوا فریوبدەن ئاواش خوایان بۆ فریودەدرێ.

لەسەرئەم خاڵەیان برێك زیاتر دەوەستین چونکە قوربانیانی ئەم بۆ چوونە زۆرە و رۆژانە دەیەها کەس دەبینین بەدەستی ئەم بازرگانانەوە( بەداخەوە بەخۆیان

دەڵێن شێخ یان مەلا ، بۆ گەرم کردنی بازارەکانیان یاری کردن بە لایەنی سۆزداری نەخۆشەکان یان کەسوکاریان ) ئازاردەدرێن بەبیانوی دەرکردنی جنۆکەوە چەندەها شێوازی نەشیاو بەکاردێنن بۆ برەودان بە بازرگانیەکان.

گرنگترین شێوازەکانی چارەسەرکردن یان ڕاستر چارەشەرکردن کە لەلایەن ئەم کەسانەوە بەکار دەهێنرێ:

- ئازاردان بەهۆی لێدان بە دار ، نەعل ، زللە، سۆندە.
- کارەبا لێدان لەسەر سنگی یان ڕانی نەخۆش !!
- سوکایەتی پێکردن بە تفکردن یان قسەی نەشیاو.
- دوعاکردن لەڕێی نوسینی چەند ئایەتێك یان فەرموودەیەك هەڵواسینی بە شوێنێکی نەخۆشەکەوە. ( هەندێجار کە ئەو نوسینانە کە دەیکەیتەوە بڕێکی باشیان جگە لە کۆمەڵێ خەتی ناشرین خواروخێچ هیچی تری تێدا نیەو هەندێ جار وێنەی سەری ئاژەڵێکی تێدایە و لێرەو لەوێ دەبیستین هەندێکیان قسەی ناشرین و جنێوی تێدایە بە کەسەکە ) .
- ڕێنمایی دان بە نەخۆش کە گوێبیستی قورئان بێت لە ڕێی هێدفۆنەوە ڕۆژانە شەش تا هەشت هەندێجار دوانزە کاژێر لە ڕۆژێکدا.
- ستمی خواردن بەوەی هەندێ خواردنی بۆ دەنوسرێ وەکو هەنگوین و ڕەشکەو .... یان ڕێگرتن لە هەندێ خواردن وەکو گۆشت.

گومان لەوەدا نیە کە بونەوەرێك هەیە بەناوی جنۆکەو خوای گەورە لە قورئاندا باسی کردوون و سورەتێك هەیە بە ناویانەوە وەك چۆن سورەتێك هەیە بە ناوی مرۆڤەوە (مەبەست سورەتی الجن و الانسان )ە ژمارەیەك فەرموودە هەیە باس لە حاڵی جنۆکە دەکات.

لێرەدا بەباشی دەزانم هەندێ لەو ئایەت و فەرموودانە بخەمە ڕوو لەگەڵ ڕاڤەکردنیان بە ئومێدی ئەوەی خوای گەورە تەوفیقمان بدات بۆ ڕێگەی ڕاست: ﴿ وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِي ۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ﴾ ابراهيم: ٢٢

لەم ئایەتەدا خوای گەورە بەڕونی باس لەوە دەکات کە شەیتان دەسەڵاتی بەسەر مرۆڤدا نیە بەڵکو تەنها بانگەشەیان دەکات ئەوانیش وەڵامی دەدەنەوە بۆیە

شەیتان پێیان دەلێ لۆمەی من مەکەن لۆمەی خۆتان بکەن ﴿ وَاذْكُرْ عَبْدَنَا أَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الشَّيْطَانُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ ﴾ ص: (٤١). ﴿ وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ﴾ الأنبياء: ٨٣). لەم دوو ئایەتەدا یەکێك لە بەندە ساڵحەکانی خوای گەورە پێغەمبەر ئەیوب ( علیه السلام ) دەستی پارانەوە بەرزدەکاتەوە لەوەی شەیتان زیانی پێگەیاندووە وشەی مەس بەکاردەهێنێت واتە بەرکەوتن ئەوەی لەم رۆژەدا هەندێ بازرگان بانگەشەی ئەوە دەکەن چارەسەری مەسی شەیتان دەکەن یان شەیتان مەسی هەیە بۆ ئەوانەی لەرووی ئیمانیەوە لاوازن. گەر بەو بۆچوونە بوایە شەیتان مەسی بۆ کەسانی ئیمان لاواز بوایە بۆ ئەمان دی سەرۆکی وولاتەکان و بازرگانە چاوچنۆکەکان و دز و جەردەکانی ئەم رۆژگارە شەیتان هیچیان لێبکات ، یان تۆ بڵێی یەکێك لە پێغەمبەرەکانی خوا ئیمانی لاوازبووبێ( پەنابەخوا ) بۆیە شەیتان دەستی لێوەشاندووە. یان ئەمانەی ئەمرۆ بروایان لەو پێغەمبەرە پتەوترە تابتوانن چارەسەری مەسی شەیتان بکەن و پێغەمبەرێکی وەك ئەیوب ( علیه السلام ) نەزانێ چۆن چارەسەردەکرێ.

لێرەدا ئەم پێغەمبەرە هێندە بە ئەدەبەوە ئاخاوتن لەگەڵ خوادا دەکات هەردوو ووشەی ( نصب و عذاب ) بە نەناسراوی دەهێنێتەوە چونکە دەزانی خوای گەورە لەو زاناترە دەزانێ مەبەستی چیە.

خۆ گەر هاوکێشەکەش پێچەوانە بکەنەوە بڵێن ئەوانەی خواناسن شەیتان دەستیان لێدەوەشێنێ تاکو خوا پەرستی نەکەن ئەوا دەبێ وەڵامی ئەو پرسیارە بدەنەوە جما خۆیان ( بازرگانەکانی ئاینی )خوا ناس نین ، یان عیبادەتەکەی ئەمان هێندە نیە پێویستی بە شەیتان هەبێ رێگری لێبکات!!

عەتای کوری ریاح دەڵێ ئیبن و عباس پێی ووتم ئافرەتێکت نیشان بدەم لە ئەهلی بەهەشت ،ووتم بەڵێ : فەرموی ئەو ئافرەتە رەشە هاتە لای پێغەمبەر پێی ووت من پەرکەمە خۆم رووت دەکەمەوە دوعام بۆ بکە. پێغەمبەر پێی ووت: گەر دەتەوێ ئارام بگرەو دەچیتە بەهەشت ، یان دوعات بۆ دەکەم خوا چاکت کاتەوە ؟ ووتی : ئارام دەگرم . پاشان ووتی خۆم رووت دەکەمەوە دوعام بۆ بکە تا خۆم رووت نەکەمەوە پێغەمبەر دوعای بۆ کرد.( ئەم فەرمودەیە بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە.( ٥٦٥٢ و٢٥٧٦ ) لەم فەرموودەیەوە سێ راستی گرنگ فێر دەبین:

١- پێغەمبەری خوا هۆکاری پەرکەمی نەگەڕاندۆتەوە بۆ شەیتان بەڵکو بۆ بوونی حاڵەتێکی جەستەیی بۆیە بەو ئافرەتە دەڵێ دوعات بۆ بکەم یان نا.

٢- گەر هۆكاری پەركەم شەیتان یان جنۆكە بوایە بێگومان پێغەمبەری خوا نەیدەهێشت موسڵمانێك بەو جۆرە بەدەست شەیتانەوە بناڵێنێ و دووجاری خۆ رووتكردنەوەی بكات.

٣- ئەوانەی دوعا دەكەن لەرێی خوێندنی قورئان بەو بۆ چوونەی قورئان جنۆكە دەردەكات دەی خۆ ئەم هاوەڵەی پێغەمبەر لەگەڵ ئەودا نوێژ دەكات گوێ بیستی پێغەمبەری خوایە لە كاتی خوێندنی قورئانەدا چۆن جنۆكە توانی لێی نزیك بێتەوە چ جای ئەوەی بچێتە لەشیەوە.یان دەبێ بازرگانەكانی ئەمرۆ لە پێغەمبەری خوا باشتر و رەوانتر قورئان بخوێنن( بەنا بەخوا ).

شەوێك پێغەمبەری خوا لە ئیعتكافدا دەبێ یەكێك لە خێزانەكانی ( سەفیەی كچی حەیی ) دێت بۆ لای لە ماڵی ئوسامەی كوری زەید دووان لە پیاوانی ئەنسار دەیان بینن پێكەوە بەخێرایی دەرۆن ئەبا پێغەمبەر هەستیان پێ بكات لەو كاتەدا پێغەمبەر بانگیان دەكا دەڵێ لەسەرخۆ بن ئەمە سەفیەی كچی حەییە ئەوانیش دەڵێن پەنا بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ( مەبەستیان لەوەیە، چۆن گومان لە تۆ دەكەین ) پێغەمبەر پێیان دەفەرمووی شەیتان وەك خوێن بە لەشدا دەگەرێ ترسام خراپەیەك بخاتە دڵتانەوە.دیارە مەبەست لەم فەرمودەیە ئەو گومانەیە كە شەیتان بۆ تاكی دروست دەكات ئیمامی شافیعی رەزا و رەحمەتی خوای لێبێت دەڵێ مەبەست لەم فەرمودەیە وەڵام دانەوەی گومانە لەشوێنی خۆیدا تاكو نەكەوینەوە گوناهەوە.

راڤە ئەم فەرمودەیە بە فەرمودەیەكی تر دەكرێت ( اتقوا مواقع الشبهات ) واتە خۆتان بپارێزن لە شوێنی گومانلێكراو.

# بەشی دووەم:

## پێناسەی تەندروستی دەرونی.

## پۆلێنکردنی پەشێویە دەرونیەکان.

## جیاوازی نێوان سایکۆسس و نیورۆسس.

## هۆکاری پەشێویە دەرونیەکان.

# پێناسەی تەندروستی دەرونی

## Definition of mental health

ڕەنگە پێناسەکردنی نەخۆشیە جەستەییەکان ئاسان بێت تارادەیەکی باش، بۆنمونە پلەی گەرمی هەرکاتی لە سنوری ٣٦,٦- ٣٧,٢ بێت ئاساییەو هەرکاتێ لەو سنورە زیاد یان کەمی کرد دەتوانین بلێن ئەو کەسە تای هەیە یان پلەی گەرمی لەشی دابەزیوە. بەهەمان شێوە بۆ نەخۆشیەکانی دڵ و کۆئەندامی هەرس کۆئەندامەکانی تر . بەڵام بۆ تەندروستی دەرونی لەبەر نەبوونی پێوەرێکی دیاری کراو لەرووی چەندێتی و چۆنێتیەوە بۆ ڕەفتاری تاك بۆیە ئاسان نیە پێناسەیەکی وورد و گشتگیری ئەوە بکرێ کێ تەندروستە و کێ نەخۆش.

### هەندێ چەك هەیە لەمەر پێناسەی تەندروستی دەرونی دەتوانین بەکورتی باسی بکەین

١- چەمکی نەبوونی نیشانە: (Absence of symptoms )

تەندروستی دەرونی بەوە پێناسە دەکات کە تاك نیشانەی نەخۆشی دەرونی نەبێت ، ئەمە چەمکێکی سلبیە شتەکان بە پێچەوانەی دەناسێتەوە تێکچونە کەسێتیەکان پشت گوێ دەخات و ناکرێ هەرکەسێ نیشانەی ئاشکرای نەبوو بە کەسێکی دەرون دروست دابنرێ.

٢- چەمکی ژمێریاری:

ئەم چەمکە تاکی دەرون دروست وا پێناسە دەکات کە ئەو تاکەیە لە ڕەفتار و کردەوە و شێوازی ژیانیدا لە زۆربەی تاکەکانی کۆمەڵگە دەچێ لە ژینگەکەی خۆی.

هەرچەندە ئەم چەمکە ڕێز بۆ زوربەی تاکەکانی کۆمەڵ دادەنێ بەڵام بەهیچ جۆرێ مەرج نیە هەرکەسێ پێچەوانەی کۆمەڵ بێ نەخۆش بێت ، چونکە دەشێ ئەو تاکانە یان کۆمەڵە کەسەی بۆ چوونی جیاوازیان هەیە یان داهێنانێکی نوێیان هەیە یان بۆچونێکی ڕەخنەگرانەیان هەیە کەسانی رۆشنبیر و داهێنەر و سەرکردە و عەبقەری بن.

٣- چەمکی پشت بەستوو بە داواکردنی یارمەتی پزیشکی:

ئەم چەمکەیان دەڵێ هەرچەندە هەندێ کەس نیشانەیان هەیە بەڵام دەتوانن ژیانی خۆیان گوزەربکەن و گرفتی تایبەتیان نیە ، واباشە ئەم خاڵە بۆ چەمکی تەندروستی زیادبکرێ هەرکەسێ ناچێ بۆ لای پزیشك یان کەسوکاری نایبەن بۆ لای پزیشك یان چارەساز ، ئەوە کەسێکی دروستە.

ئەم چەمکە زۆرجێی مەترسیە چونکە برێکی زۆر لە هاوڵاتیان دەشێ گرفتی ئابووریان هەبێ بۆیە

سەردانی پزیشك نەكەن یان بارودۆخ گونجاو نیە بۆ سەردان یان هۆشمەندی خۆی لە دەست داوە یان كەسوكاری چاودێری دروستی بۆ ناكەن لەبەرهۆیەك یان هۆیەكی تر. ئایا ئەمانە هەمویان تەندروستن و حالەتی نەخۆشیان نیە؟!

٤- چەمكی پەیوەست بە پەككەوتەیی:

تەندروستی دەرونی بە پێی پلەی پەككەوتەیی لە بوارە سەرەكیەكانی ژیاندا دەپێورێ ئەویش بواری كاركردن و خۆگونجاندنی كۆمەلأیەتییە.

ئەم بوچوونە یەكێكە لە گرنگترین بۆ چونەكان چونكە تەندروستی دەبەستێتەوە بە توانای تاكەكان و پەیوەندیان بەلأم ئەوە پشت گوێ دەخات كە دەشێ ئەم خۆگونجاندن و كاركردنە لەسەر زیان گەیاندن بە خود یان خۆگونجاندی ناوەكی بێت.

٥- پێناسەی رێكخراوی تەندروستی جیهانی:

تەندروستی دەرونی بریتیە لە توانای جێبەجێكردنی كاری رۆژانەو ژیان بە شێوەیەك كە چالاكی و سەربەخۆیی گونجاو بەدیبهێنێت و خۆگونجاندن لەگەڵ كۆمەلگەو دەوروبەردا بەدیبهێنێت و ئەمە لەگەڵ بوونی هاوسەنگی خودی كەبەهۆیەوە رێگر دەبێت لە هەرنارەحەتیەكی جەستەیی. واتە تەندروستی دەرونی بریتیە لە چالاكی ،هاوسەنگی ، خۆگونجاندن.

بەلأم نەخۆشی دەرونی بریتیە لە نەبوونی باری دەرون دروستی ئەمەش ناسینەوەی شتەكانە بە پێچەوانەكەی باشتر وایە بلێین بریتیە لە پلەیەكی گەورە لە پەككەوتەیی یان نارەحەتی كەوا لە تاك دەكات لە بەركەوتندا بێت لەگەڵ خۆیدا یان لەگەڵ چواردەوردا یان لادانێكی سلبیانە لەوان .

# پۆلێن کردنی نەخۆشیە دەروونیەکان

## Classification of mental disorders

یەکێك لەو گرفتانەی لە کاتی سەردانی نەخۆش یان کەس وکاری نەخۆشدا بۆ کلینیکەکان تێبینی دەکرێ ئەوە کاتێك دەڵێی نەخۆشەکەتان نەخۆشی چی هەیە دەڵێ دکتۆر دەڵێن نەخۆشی دەرونی یان نەخۆشی نەفسی هەیە کاتێك دەڵێ چ جۆرە نەخۆشیەکی دەرونی دەڵێ دکتۆر گیان دەونیە دەرونی !!.

بێگومان ئەم ووشانە نەخۆش لە هەندێ پزیشکەوە فێری بووە کە بە نەخۆش دەڵێ حالەتی دەرونیت هەیە یان هەندێجار بە کەسوکاری نەخۆش دەڵێ کاکە گیان تێکچوە؟! هەندێجار ووشەی لەوەش نەشیاوتر بەکاردێنێ و هۆکاری سەرەکی ئەم رەفتارەش بۆ دوو خاڵی سەرەکی دەگەڕێتەوە:

١- پزیشك نازانێت جۆری نەخۆشەکە دیاری بکات بۆیە بەم رستەیە خۆی دەپەڕێنێتەوە.

٢- دەترسێ لەوەی گەر ناوی نەخۆشیەکە بلێ نەخۆش و کەسوکاری نەخۆش پرسیاری لێبکەن لەمەر ئەو نەخۆشیە و نەتوانێت وەلامیان بداتەوە.

٣- کەمی کات و ئەو ماوەیەی دایدەنێت بۆ بینینی نەخۆش وا دەکات لە راستیە زانستیەکان بەدوور بێت قسەکانی زیاتر بازاڕی بێت.

### بە شێوەیەکی سەرەکی دوو جۆر پۆلێن کردن هەیە:

١- پۆلێن کردنی نێودەولەتی بۆ نەخۆشیەکان:

(International classification of disease)

لە وولاتانی ئەوروپاو زۆربەی وولاتانی جیهاندا پەیرەو دەکرێ.

٢- مانوەلی دەست نیشان کردن و ئامارکردنی نەخۆشیە دەرونیەکان چاپی چوارەم:

(Diagnosis and Statistical Manual of Mental Disorder-IV)

ئەم مانوەلە زیاتر لە ئەمەریکا پەیرەو دەکرێ، بە پێی ئەم مانوەلە هەر نەخۆشیەو کۆدی تایبەتی خۆی هەیە و بۆ دەست نیشان کردنی هەر حالەتێك پێویستە تاك برێکی دیاری کراو نیشانەی هەبێ بۆ ماوەیەکی دیاری کراو کە لە مانوەلەکەدا باس لە کەمترین ماوە دەکات ، ئەو نیشانانە بەهۆی بەکارهێنانی

مادەهۆشبەرەکانەوە دروست نەبوبیٚ و نەگەرێتەوە بۆ بوونی نەخۆشی جەستەیی.

ئەوەی جێی ئاماژەیە لەم ماوەلەدا بۆ وەسفکردنی حاڵەتی هەر کەسێك لە پێنج ئاستدا یان تەوەرەدا باس دەکرێت:

تەوەری یەکەم: تایبەتەبە بوونی هەر نەخۆشیەکی دەرونی وەکو خەمۆکی ، دڵەراوکێ، سکیزۆفرینیا....... هتد.

تەوەری دووەم: تایبەتە بە کەسێتی و ئاستی ژیری . ئایا تاك هیچ کام لە تەنگژەکانی کەسێتی هەیە یان خاوەن کەسێتیەکی ئاساییە ، هەروەها ئاستی ژیری تاك باس دەکریٚ ئایا لە سنووری ئاسایی دایە یان توانی ژیری کەمترە لە کەسانی تر.

تەوەری سێیەم: تایبەتەبە نەخۆشیە جەستەییەکان وەکو کۆئەندامی هەناسە یان کۆئەندامی سوڕان کۆئەندامی هەرس ....... هتد.

تەوەری چوارەم: تایبەتە بە گرفتە کۆمەلایەتی و ژینگەییەکان کە زیاتر جەخت دەخرێتە سەر دواسالاٚ و یان هەر رووداوێك کە پێشتریش روویدابیٚ بەلاٚم کاریگەری گەورەی هەبیٚ لەسەر ژیانی تاك .

- گۆڕانکاری لە باری خێزانی ( مارەبرین، ژنهێنان ، شووکردن، جیابونەوە، منداڵ بوون ).
- رفت لە پەیوەندیەکاندا لەگەڵ هاوریٚ وهاوسێدا.
- گرفت لە بواری کاردا ( بێکاری ، گرفت لە خوێندنگە، خانەنشینی )
- مالٚ گواستنەوە.
- گۆڕانکاری لە بواری ئابوری( لەدەست دان ، وونبوون ).
- گرفتی یاسایی ( دەستگیرکردن ، تاوانبارکردن )
- قەناغەکانی گەشە ( هەرزەکاری، تەمەنی نائومێدی )
- گرفتی تر ( روداوی سروشتی ، فڕاندن، سکی نەخوازراو... )

تەوەری پێنجەم: تایبەتە بە هەلسەنگاندی گشتی توانای کار لە کاتی پشکنیندا لە سیٚ بواردا ( دەرونی ،کۆمەلایەتی،کارکردن ) تێکرای نمرە لەسەر ١٠٠ دادەنریٚ کەمترین نمرە سفرە و بەرزترین نمرەش ١٠٠ ە.

نمونــــه : ژنێکــــی تەمــــەن ٣٨ ســــاڵان ، ناســــتی خوێنــــدنی ســــەرەتای هەیــــەو بــــە پێ نیــــشانەکانی حاڵــــەتی خــــەمۆکی هەیــــە ، پــــاش پــــشکنین دەرکــــەوت کــــە نەخۆشــــی برینــــی دوانزەگرێــــی هەیــــە، لــــەرووی کۆمەڵایەتیــــەوە لــــە چــــواردەور دابــــراوە حــــەزدەکات زیــــاتر بەتــــەنها بێت، بــــە پێی کــــەس کارەکــــەی دەڵــــێن کەســــێکی تورەیــــەو لەگــــەڵ کەســــدا پێــــی نــــاکرێ و پــــێش نەخۆشــــیەکەش هــــاورێی کــــەم بــــووە حــــەزی بــــە تێکــــەڵی نــــەکردووە و بــــڕوای بــــە دەوروبــــەر نیــــە .مــــاوەی ٢ ســــاڵە لــــە هاوســــەرەکەی جیابۆتــــەوە و ســــێ منــــداڵی هەیــــە لای مێردەکــــەین و زۆر بێتاقــــەتیان( بیریــــان ) دەکــــات. بــــیری خۆکــــوژی هەیــــە و پێــــشتر هــــەوڵی خۆکوشتنی داوە. حاڵەتی ئەم ژنە بەم جۆرە پۆلێن دەکرێ:

تەوەرەی یەکەم : نەخۆشی خەمۆکی.

تەوەرەی دووەم: کەسێکی بێ باوەڕ بە دوروبەر، گۆشەگیر.

تەوەری سێیەم: نەخۆشی برینی گەدە.

تەوەرەی چوارەم: جیابونەوە لە هاوسەرەکەی، دووری منداڵەکان.

تەوەرەی پێنجەم: کەمتر لە ٥٠ چونکە بیر و هەوڵی خۆکوشتنی هەیە.

## جیاوازی نێوان سایکۆسس و نیوڕۆسس

## Differences between psychosis and neurosis

| | سایکۆسس (زوهان) | نیوڕۆسس (دەماری) |
|---|---|---|
| -١ | تاك داننانێت بەوەی کە نەخۆشە گەر خۆی بە نەخۆشیش بزانێ خۆی بە نەخۆشی دەرونی نازانی یان ڕازی نابێت چارەسەر وەرگرێ | تاك خۆی سەردانی پزیشك دەکات یان داوا دەکات کەسوکاری بیبەن بۆ لای پزیشك یان هەر چارەسازێکی تر. |
| -٢ | قسەکانی نەخۆش روون نیە و هەرجارەی شتێك دەڵێ لە کاتی دانیشتن لەگەڵیدا هەست بە ناتەواوی شێوە و ناوەرۆکی قسەکان دەکەیت. | گرفت لە ئاخاوتن و ناوەرۆکی قسەدا نیە و دەشێ هەندێ جار کەم دوو بێت وەك لە حاڵەتی خەمۆکیدا. |

| -٣ | لەرووی پۆشاك لەبەركردنەوە شێوازێكی سەیروسەرنج راكێشی هەیە هەموو كەسێ دەتوانێت دەرك بەوە بكات ئەم پۆشاكە بۆ ئەم وەرز و تەمەن و رەگەزە نەگونجاوە . | شێوازێكی دروستە بەلأم دەشێ هەندێجار بایەخنەدانی پێوەدیاربێ لەرووی پاك خاوێنی یان لەرووی هەڵبژاردنی رەنگەكان. |
|---|---|---|
| -٤ | بوونی هەڵوەسە (بیستن ، بینین، بۆنكردن ، تامكردن یان بەركەوتن) | نەبوونی هەڵوەسە. |
| -٥ | بونی وەهم (delusion) | نەبونی وەهم یان بەكەمی روودەدات. |
| -٦ | هەندێ جار بێئاگایی لە كات و شوێن و كەسەكان. | نەبونی ئەم حاڵەتە گەر هەشبێ بەهۆی بێ ئارەزووییەوە بۆ وەلأمدانەوە نەك بە هۆی نەزانینەوە. |
| -٧ | نەتوانینی راڤەكردنی پەندەكان و لێكچون وجیاوازیەكان. | توانینی راڤەكردن و لێكچون و جیاوازیكردن. |
| -٨ | گرفتی بیركردنەوە خێرابیركردنەوە و بازدان لە بابەتێكەوە بۆ بابەتێكی تر مەرج نیە پەیوەندی لەنێوان بابەتەكاندا هەبێت. | بیركردنەوە ئاساییە یان زۆرجار خاوەبێتەوە یان شلەژانی پێوە دیارە. |
| -٩ | گۆرانكاری ئاشكرا لەهەڵسوكەوت ( فرەجوڵەیی ، گەرانی بەردەوام ، توندوتیژی بەرامبەر هەندێ كەس یان بەرامبەر هەموان، خۆروتكردنەوە ......) | زۆربەكەمی رودەدات ناگاتە ئەو ئاستە ترسناكە. |
| -١٠ | زۆرجار پاش چاك بونەوە روداوەكانی بیرنامێنێت. • | زۆربەی كات روداوەكانی دێتەوە یاد. |
| -١١ | نمونە وەكو: سكیزۆفرینیا، شادی ، وەهم ....... | نمونە وەكو: خەمۆكی ، دڵەراوكێ، واسواسی |
| -12 | سوود لە جەلسەی دەرونی وەرناگرێ یان زۆر بەكەمی و لەهەندێ بواردا سوود وەردەگرێ . | لە زوربەی كاتەكاندا سوود لە جەلسە و رێنمایی دەرونی وەردەگرێت. |

| -13 | تاك دەشێ یەكێ یان زیاتر لەمانەی سەرەوەی هەبێ | هەندێ جار نیشانەیەك یان زیاتری ستونی یەكەمی هەیە و كەسەكەش بە سایكۆسس دانانرێ. |
|---|---|---|

# هۆكاری پەشێویەكان دەروونییەكان

# Aetiology of mental disorders

نەخۆشییە دەروونییەكان بە شێكی گرنگی زانستی نەخۆشی پێك دێنن ، لە رۆژگاری ئەمرۆدا گرنگی بەرچاویان هەیە و ژمارەیەكی زۆری هاوولاتیان بەدەستییەوە دەناڵێنن ، هەندێ سەرژمێری باس لە نزیكەی ١٠٪ دانیشتوان و هەندێكی تر باس لە ٣٠٪ دانیشتوان دەكات .

گومانی لەوەدا نییە هۆكاری سەرجەم نەخۆشییەكان یەك نییە و تاكە تیۆرێك ناتوانێت راڤەی سەرجەم نەخۆشیەكان بكات، بۆیە زیاتر لە كۆمەڵە هۆكارێك باس دەكرێت بەشێوەیەكی گشتی دەتوانین هۆكارەكان بكەین بە دوو بەشەوە:

یەكەم : هۆكاری ناوەكی ( بۆماوە و پێك هاتەی لەش و كەسێتی...... )

دووەم: هۆكالای دەرەكی ( گۆرانكاری كۆمەلایەتی و ئابوری ......... )

بە پێی سەرچاوە نوێكان هۆكارەكان پۆلێن دەكرێن بۆ سێ كۆمەڵە هۆكاری سەرەكی:

١- هۆكاری ئامادەباشی: بریتییە لەو هۆكارانەی لە خودی تاكدا هەن و وای لێدەكەن ئەگەری توشبوونی بە نەخۆشی زۆرتر بێت وەك لە كەسانی تر.

- بۆماوە:

رۆڵی ئاشكرای هەیە لەزۆربەی یان سەرجەم نەخۆشییە دەروونییەكاندا بۆ نمونە رێژەی توشبوون بە نەخۆشی سكیزۆفرینیا بە شێوەیەكی گشتی نزیكەی( ٠,٨٪ – ١٪ ) دەبێ لەگەڵا برێك جیاوازی لە ناوچەیەك بۆ ناوچەیەكی تر بەلام گەر یەكێ لە باوان ئەم نەخۆشییەی بوو ئەگەری توشبوونی منداڵەكانی بە پێی هەندێ توێژینەوە بەرز دەبێتەوە بۆ نزیكەی ( ١١٪ ) خۆ گەر هەردوو باوان هەمان حاڵەتیان هەبوو گریمانەكە بۆ نزیكەی ( ٣٦٪ ) بەرز دەبێتەوە.

ئەو توێژینەوانەی لە سەر دووانە كراون هەمان راستی دەردەخەن بەوەی لە

دووانـــەی خـــاوەن یـــەك هێلكـــە ئەگـــەری توشـــبوون نزیكـــەی (٥٠٪) و لەدوانـــەی دوو هێلكـــەدا نزیكەی (١٠٪) دەبێت .

لـــە حالـــەتی خەمۆكیـــدا هـــەمان دەرئـــە نجام بەدەســـت كـــەوتووە بـــە پێـــی لێكۆلینـــەوەكانی (مـــاك گـــوفین و هاوەڵـــەكانی) ، پەشـــێوی مـــەزاجی یـــەك جەمـــسەری لـــە دووانـــەی یـــەك هێلكـــەدا نزیكـــەی (٤٦٪) لـــە دووانـــەی دووهێلكـــەدا نزیكـــەی (٢٠٪) دەبێـــت. بـــە پێـــی توێژینـــەوەكانی (ســـاندەرو هاوەڵـــەكانی) پەشـــێوی مـــەزاجی دووجەمـــسەری لەدووانـــەی یـــەك هێلكـــەدا ســـێ هێنـــدەی دووانـــەی دووهێلكـــە دەبێـــت .﴿ واتـــە گـــەر یـــەكێك لـــە دووانـــە نەخۆشـــییەكەی هـــەبێ ئەگـــەری توشـــبوونی دووەمیـــان بـــەو رێژانەی سەرەوە دەبێت﴾.

- پێك هاتەی لەش :

تێبـــینی كـــراوە ئـــەو كەســـانەی پێـــك هاتـــەی لەشـــیان باریـــك و درێـــژە زیـــاتر ئەگـــەری توشـــبونیان هەیـــە بـــە ســـكیزۆفرینیا و ئەوانـــەی قەڵـــەو وكـــورتن زیـــاتر توشـــی پەشـــێوی مەزاج دەبن( خەمۆكی –شادی ).

- گۆڕان لە قەبارەی مێشك و هەندێ بەشی مێشك :

بـــەهۆی بـــەكارهێنانی وێنـــەی كۆمپیوتـــەری و وێنـــەی رەنـــینی موگناتیـــسی و ئـــەو پـــشكنینانەی بـــۆ كاروچـــالاكی مێـــشك دەكـــرێ وای دەردەخـــات زیـــاتر لـــە گۆڕانێـــك هەیـــە لـــە پێكهاتـــەو قـــەبارە و رەنـــگ و چـــالاكی مێـــشك . ئـــەو پـــشكنینانەی بـــۆ مێـــشكی نەخۆشـــەكان كـــراوە پـــاش مردنیـــان ئـــەم راســـتیانە دەســـەلمێنێ .ئـــەم گۆڕانكاریانـــە پەیوەنـــدار نییـــە بەماوەی نەخۆشییەكە.

- گۆڕان لە ئاستی وەرگرەكان :

لەمێـــشكی مرۆڤـــدا گـــەلێك وەرگـــر هەیـــە هەریەكـــەیان فرمـــانی تایبـــەتی خـــۆی هەیـــە و گۆڕانكـــاری لـــە ژمـــارەو چـــالاكی هەریەكـــەیان كاریگـــەری ئاشـــكرای هەیـــە لـــە دەركـــەوتنی هەنـــدێ نیـــشانەو نەخۆشـــی . بـــۆ نمونـــە زۆربـــوونی ژمـــارە و چـــالاكی وەرگرەگـــانی دۆپـــامین و ســـیرۆتۆنین رۆڵـــی ئاشـــكرای هەیـــە لـــە نەخۆشـــی ســـكیزۆفرینیا ، لـــە نەخۆشـــی خەمۆكیـــدا حالەتـــە پێـــچەوانەدەبێتەوە . هـــەروەها دابـــەزینی ئاســـتی ٥- هایدرۆكـــسی ئێنـــدۆل ئەسیدیك ئەسید لە شلەی دركە پەتكدا ئەگەری توندوتیژی زیاتر دەكات.

• کەسێتی ( کەسایەتی ):

هەریەکە لە ئێمە خاوەن جۆرە کەسێتییەکی تایبەتە و زۆربەی خەڵکیش کەسایەتییەکی ئاسایی ( نۆرماڵ ) یان هەیە نزیکەی بە ( ١٥٪ ) خەڵکی خاوەن کەسایەتی نائاساین . بۆ نمونە ئەوانەی خاوەن کەسایەتییەکی هستیرین زیاتر ئەگەری توشبونیان هەیە بە نەخۆشی هستریا و کەسێتی سکیزۆید زیاتر توشی سکیزۆفرینیا دەبن ، بیرمان نەچێ لە تاکە کەسێکدا دەشێ خەسڵەتی زیاتر لە کەسێتیەکی هەبێ .

٢- ئەو گۆڕانکارییانەی پێش سەرهەڵدانی نەخۆشییەکە روودەدەن: بریتییە لەو هۆکارانەی پێش سەرهەڵدانی نەخۆشییەکە بەماوەیەك روودەدەن ، گرنگترینی ئەو هۆکارانەش :

• گۆڕانکاری فیزیایی :

وەکو بەکارهێنانی دەرمان ( زیاتر لە دەرمانێك هەیە دەشێ ببێتە هۆی وەدەرکەوتنی هەندێ نیشانە یان تەنانەت نەخۆشی دەروونی یەکێك لەو دەرمانانە کەبە شێوەیەکی بەرچاو لەلایەن مێینەوە بەکاردەهێنرێ بەمەبەستی خۆ قەلەو کردن حەبی دیکسامیسازۆنە هەندێ جار دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی حالەتی سایکۆسس وئەم حالەتەش پەیوەست نییە بە بڕی مادەی بەکارهاتوو واتە دەشێ بڕێکی کەم ئەم حالەتە دروست بکات ) . بەرکەوتن بە هەموو جۆرەکانییەوە بەتایبەتی برینداری سەر کە خوێن بەربوونی ناوکاسەی سەر و بورانەوەو شت بیرچونەوە لێوە پەیدابێ .

سەرهەڵدانی هەندێ نەخۆشی دەبێتە هاندەر بۆ وەدەرکەوتنی هەندێ نیشانە یان تەنانەت نەخۆشی دەروونی ، وەکو نەخۆشییە درێژ خایەنەکان( بەرزی فشاری خوێن، شەکرە ....... ) یان هەندێ حالەت کە چارەسەری نییە یان بە زەحمەت چارەسەردەکرێ ( برینەوەی یەکێك لە پەلەکان بە هۆی روداوەوە یان بە هۆی نەخۆشیەوە ، شێرپەنجە ) دەبێتە گۆڕانکاری لە مەزاجی تاك و توشی خەمۆکی یا

دڵەراوکێ یا هەندێ حالەتی تری دەکات .

بەکارهێنانی هەندێ مادە وەکو ئەلکحول ( یەکێکە لە پێکهاتەکانی مەی ) و مادە هۆشبەرەکان دەبێتە هەندەر بۆ زیاتر توشبون بە خەمۆکی و دڵەراوکی ، لە کاتێکدا هەندێ کەس بەکاریدێنن بۆ رزگاربوون لە خەمۆکی !!

• گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و ئابووری:

وەکو لەدەست دانی یەکێك یا زیاتر لە ئەندامانی خێزان یا هاورێیەك ، جیابونەوە، تەڵاقدان هەریەکەیان کاریگەری ئاشکرای خۆی هەیە لەسەر ژیانی تاك . هەروەها لەدەست دانی سەروەت و سامان و کار و پیشە هەمان کاریگەری هەیە .....هتد.

ئەوەی تێبینی دەکرێ گۆڕانکاری خێرای باری ئابووری کاریگەری گەورەی هەیە بەتایبەتی کاتێك گۆڕان بەرەو دابەزینی ئاستی ژیان بێت وە تێبینی کراوە کاریگەری ئەم گۆڕانە زیاترە لەوەی تاك لەئاستی نزمدا بژی ( واتە نەخۆشییە دەروونییەکان لەو کەسانەی گۆڕانی خێرایان بەسەر دێ زیاترە وەك لەوانەی لە ئاستێکی نزمی ئابوریدا دەژین ) هەروەها هەڵکشان بەرەو ئاستی بەرزیش کاریگەری خۆی هەیە.

• زەبری دەروونی:

زەبری دەروونی بەهەر شێوەیەك بێ دووچاربوون یا بینین یا بیستنی دیمەنی ترسناك یا ناچارکردن بۆ بەشداری لەو کردەوانەدا دەبێتە هۆی زیاتر سەردانی پەشێویە دەرونیەکان وەکو خەمۆکی و دڵەراوکێ و زەبری ( هدمەی ) دەرونی پاش فشار و خراپ بەکارهێنانی دەرمان و پەنابردنە بەر ئەلکحول و مادە هۆشبەرەکان. ئەگەری ئەم پەشێویانە بە پێ جۆر و ماوەی زەبرەکە و تایبەتمەندیەکانی تاك دەگۆرێ.

• هۆکاری رۆشنبیری :

لەو کۆمەڵگایانەی بەرەو رووی زیاتر لە رۆشنبیریەك دەبنەوە بەتایبەی گەر لەگەڵ بنەما مەعریفی و کەلتوریەکانی ئەو کۆمەڵگایەدا جیاوازبێت ئەوا رێژەو ژمارەی نەخۆشییە دەروونییەکان زیاتر دەبێ بەتایبەتی کاتێك تاك توشی

پاشاگەردانی دەبێ وناسۆی نایندەی لاروون نییە و دەبێتە خاوەن کۆمەڵە رۆشنبیرەکی ناتەواو و تێکەڵەیەک لە دیدو بۆچوون وەردەگرێ هیچیان تونێتی مەعریفی ناشکێنێ ، زۆرجار بەدوو ئاراستەی پێچەوانە کاردەکەن و تاک توشی کێشمەکێش و تەنگژەی دەروونی دەکەن. ڕەنگە باشترین نمونەی ئەم حالەتە ئەو ولاتانە بێت کەلەلایەن ولاتێکی ترەوە داگیردەکرێ یان رزگاردەکرێ خاوەن کەلتورو رۆشنبیریەکی جیاوازە تاکەکانی ئەو ولاتە زیاتر توشی پەشێویە دەرونیەکان دەبن بێگومان بیرمان نەچێ لە هەمان کاتدا هۆکاری تریش هەیە وەکو توندوتیژی و کوژران و برینداربوون و لە دەستدان کە هەمووی لە کاتی جەنگی رزگاریدا یان داگیرکاریدا روودەدات.

• کۆچ و نامۆبوون :

ئەو لێکۆلینەوانەی لە سەر ئەو کەسانە کراون کە کۆچیان کردووە وای دەردەخات رێژەی نەخۆشییە دەروونییەکان چەند هێندە لە کۆچ کردوەکاندا. لە توێژینەوەیەکدا لەسەر ئەو هاوولاتیانەی ئەرویج کە کۆچیان کردووە بۆ ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا وای دەردەخات رێژەی توشبون بە سکیزۆفرینیا دوو هێندەی دانیشتوانی ئەرویجە. هەروەها کۆچکردن دەبێتە هاندەر بۆ سەرهەڵدانی ئەو نەخۆشیانەی تاک ئامادەباشی هەیە بۆیان .

بە لە بەرچاوگرتنی جیاوازی باری کۆمەلایەتی هەردوو ناوچەکە تاکو جیاوازی زۆر بێت ئەگەری توشبوون زیاترە ، هەروەها تەمەنی کۆچەر کاریگەری گەورەی هەیە لەتوانای خۆگونجاندن لەگەڵ ژینگەی نوێدا.

بیرمان نەچێ تاکو تاک ماوەیەکی زیاتر بمێنێتەوە رێژەی توشبوون روولەکەم بوونە، بەمەرجێ هۆکاری نوێ نەیەتە ئاراوە.

٣- هۆکاری بەردەوام بوون : بریتییە لەو هۆکارانەی دەبنە هۆی بەردەوامی نەخۆشییەکە و هەندێ جار خراپتربوونی و سەرهەلدانی حالەتی نوێ.

• خودی نەخۆشییەکە :

هەندێجار دەبێتە هۆی بەردەوام بوونی حالەتەکە یان سەرنانی بۆ حالەتێکی خراپتر، بۆ نمونە لە حالەتی ترس دا تاک بەردەوام لە دیاردە و شتەکان

دەسڵەمێتەوە و خۆی بەدوور دەگرێ بەمەش کاردەکاتە سەر ئاستی چالاکی کۆمەڵایەتی و تواناکانی و دواکەوتنی کاری رۆژانەی، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی باری نەخۆشییەکە بەرەو خراپتر بەرێت و هەندێجار ببێتە هۆی سەرهەڵدانی گرفت و حالەتی نوێ.

- خێزان و کۆمەڵگە:

رۆڵی بەرچاویان هەیە لە چارەسەرکردن یان بەرەو خراپ بردنی باری نەخۆش، لەرێی گاڵتە پێکردن و جیاکردنەوە و سزادان و بەکارهێنانی گەلێ رێ چارەی هەڵە، زۆرجار لە بری سوود زیانی گەورەی بۆ نەخۆش هەیەو لەبری چاك بوونەوە نەك تەنها بارەکە خراپتردەکا بەڵکو دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی هەندێ حالەتی تر دەشێ لە نەخۆشییەکە ترسناك تر بێت.

ئەوەی جێی ئاماژە بۆکردنە مەرج نییە هەر نەخۆشەو تەنها هۆکارێکی هەبێ بەڵکو زۆرجار وارێك دەکەوێ زیاتر لە هۆکارێك لە هەمان نەخۆشدا هەیە بۆ نمونە کەسێکی توشبوو بە سکیزۆفرینیا دەشێ ئامادەباشی بۆماوەیی هەبێ و خاوەن کەسایەتییەکی شیزۆیی بێت وتوشی کێشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی بووبێ و بە هەرهۆیەك بێت ناچاربووبێ یان ناچارکرابێ کۆچ بکات و رەنگە لە خێزان و کۆمەڵگەیەکی دواکەوتودابێت.

بۆیە بوونی هۆکارێك نابێتە بەربەست لە بەردەم بونی هۆکاری ترداو دەبێ بەووردی لە هەموو لایەنەکانی نەخۆشیەکە بکۆڵینەوە و ئەو هۆکارانەی ئەگەری گۆڕانیان هەیە چارەسەریان بکەین.

## له نێوان جەستە و دەرونــدا

## Between body and psych

مــرۆڤ لــە کۆنــەوە دەرکــی بــەوە کــردووە کــە پەیوەندییــەکی ئاشــکرا هەیــە لــە نێــوان جەســتەو دەرونــدا ، ئــەم ڕاســتییە رۆژ بــە رۆژ روونــتر و بەرجەســتەتر بــووە و زانــستی دەرونزانــی لــەمرۆدا ئــەو پەیوەندییــە روونــتر دەســەلمێنێ بــە جۆرێــك کــەس نــاتوانێ نکوڵی لەو ڕاستییە بکات.

ئــەم پەیوەندییــە بــە هــەردوو ئاڕاســتەکە هەیــە واتــە نەخۆشــییە جەســتەییەکان کاریگــەریان هەیــە لەســەر شــلەژان و نیــشانە دەرونییــەکان لەهــەمان کاتــدا پەشــێویە دەرونییەکان دەبنە هۆی نەخۆشی و نیشانەی جەستەییەکان.

**یەکەم: کاریگەری جەستە لەسەر دەرون:**

هەنــدێجار نەخۆشــییە جەســتەییەکان دەبێتــە هــۆی ســەرهەڵدانی نەخۆشــی دەرونــی وەکــو ئــەوەی تاکێــك دەستنیــشان بکرێــت بــەوەی نەخۆشــییەکی درێژخایــەنی هەیــە ( نەخۆشــی شــەکرە ، بــەرزی فــشاری خــوێن.... ) یــان نەخۆشــییەکی هەیــە ئەگــەری چــاك بوونــەوەی لاوازە یــان لــە دواقۆناغــەکانی نەخۆشــییەکەدایە و ئەگــەری چــاك بوونــەوەی نییــە ،یــان بــەهۆی رووداوی بەرکەوتنــەوە تووشــی ناتــەواوی جەســتەیی یــان تێــك چــوونی جەســتەیی ﴿کــاتی یــان هەمیــشەیی﴾ دەبێــت .بێگومــان ئــەم هەواڵــە جگــە لــە نیــشانە جەســتەییەکانی تایبــەت بــە بارەکــە کۆمــەڵێ نیــشانەی دەرونــی هاوشــانی دەبــن وەکــو دڵ تــەنگی و نــەمانی ئــارەزووی کــار کــردن و بــێ ئومێــدی و..... کــە هێنــدە تونــد و درێــژ خایەنــە کــە دەتوانرێــت بــە شــلەژانێکی دەرونــی دەستنیــشان بکرێــت وەکــو خــەمۆکی یان دڵەراوکێ ....

بــۆ نمونــە تــاکێکی تەمــەن ٤٥ ســاڵ کاتێــك پێــی دەڵــێن تــۆ نەخۆشــی جەڵتــەی دڵتــە دەبــێ بــە ئاگابیــت و پــارێزی تەواوبکــەیت و خــۆت مانــدوو نەکــەیت ، ئــەم تاکــە دەســت دەکــات بــەوەی لــە دنیــا دابرێــت و بــەرەو تەمــەڵی بــروات و هەمیــشە بــاس لــە حاڵــەتی خــۆی بکــات و لۆمــەی رۆژگــار بکــات کەبــەم گە نجیــە چــۆن وای بەســەرهات بۆیــە دەبینــی پــاش ماوەیــەك کاریگەریــە دەرونــی و کۆمەڵایەتیــەکانی نەخۆشــیەکە لــە خــودی نەخۆشیەکە زیاتر زیانیان پێگەیاندوە.

هەنــدێ جــار نەخۆشــییە جەســتەییەکان دەبێتــە هــۆی ســەرهەڵدانی نیــشانەی

دەروونی وەکو ئەو نیشانە دەروونییانەی هاوشانن لەگەڵ نەخۆشی زیادبوون یان کەمبوونەوەی چالاکی رژێنی پەریزادە ( غدەی دەرەقی ) وەکو دڵ تەنگی و نەبوونی ئارەزووی کارکردن وکەمی هۆشپێدان و لاوازی بە ئاگایی و زوو هەڵچون و بێ ئارامی.

## دوو مم : کاریگەری شلەژانە دەرونیەکان لەسەر جەستە :

١- شلەژانە دەرونییەکان دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی نیشانە جەستەییەکان: بۆ نمونە نیشانە جەستەییەکانی نەخۆشی خەمۆکی وەکو گۆران لە شەهییەی خواردن ﴿کەم بوون یان زیاد بوون﴾ و تێك چونی نوستن ﴿کەم بوون یان زیاد بوون﴾ و تێکچونی سوری مانگانە..... . هەروەها نیشانە جەستەییەکانی دڵەراوکێ وەکو خێرا لێدانی دڵ و بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن و دڵتێکەڵ هاتن و هێلنج دان و زوومیزکردن و تێك چوونی سووری مانگانە و .

٢- شلەژانە دەرونییەکان دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی نەخۆشییە جەستەییەکان: ئەو نەخۆشیە جەستەییانەی لە ئەنجامی شلەژانی دەرونییەوە پەیدا دەبێت گەلێ زۆرن و نیشانەکانیان دەگۆرێت بە پێی ئەو سیستەمەی ( کۆئەندامەی ) کە تووش دەبێت و هەروەها لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی تر جیاوازی . ئەم کۆمەڵە نەخۆشییە پێیان دەڵێن نەخۆشییە سایکۆسۆماتییەکان .دەتوانین بلێین هیچ کۆئەندامێکی لەش نییە بە دوور بێت لە کاریگەری باری دەرونی.

٣- تێکچوونەکانی کۆئەندامی سوران: لە هەموو کۆئەندامەکانی تر زیاتر نیشانەکانی تێدا بەدی دەکرێت دیارە هۆی ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەو پایە گرنگەی کە دڵ هەیەتی لای تاك هەروەها کاریگەری ئاشکرای لە رووی سۆزداری و مانای ژیان و مردن لە لایەك و لە لایەکی ترەوە ئەم کۆئەندامە پێش کۆئەندامەکانی تر وەلام دانەوەی هەیە بۆ گۆرانکارییە دەرونی وسۆزدارییەکان .لەو گۆرانکاریانەش وەکو هەست کردن بەئازار لە ناوچەی دڵدا و خێرا لێدانی دڵ و دڵەکوتێ بەرزبونەوەی فشاری خوێن یان هەندێجار نزم بوونەوەی ، یان نیشانە لاوەکییەکانی کە ئەنجامی هەست کردنە بە نەخۆشی یان ناتەواوی لە دڵدا وەکو هەناسە تەنگی و سەرگێژبوون و لەرزین.

٤- کۆئەندامی هەرس: تەنگژە دەرونیەکان کاریگەری ئاشکرای هەیە لەسەر ئەم کۆئەندامە هەر لەنەمانی ئارەزووی خواردن ودڵ تێکەڵ هاتن و سکچوون ورشانەو ئازاری ناو سك ، رەنگە ببێتە هۆی برینی گەدە و دوانزەگری و هەوکردنی کۆلۆن و برینی کۆلۆن .

٥- کۆئەندامی هەناسە :خێرا هەناسە دان یان هەناسەی قول و پچر پچر و هەناسە

بركێ ﴿كورتە هەناسە﴾.

٦- كۆئەندامی جوڵە: پەیوەندی نێوان نەخۆشیەكانی كۆئەندامی جوڵە و باری دەرونی جێی بایەخ و سەرنج راكێشانی گەلێك لە توێژەران بووە. بە پێی لێكۆڵینەوەكان باوەڕێكی زیاتر هەیە لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئەو دووانە بەڵام ووردەكاری ئەو پەیوەندییە روون نییە .

٧- كۆئەندامی دەمار: پەیوەندی نێوان باری دەرونی و سەرئێشە و بێخەوی و سەرگێژبوون و مێروولەكردن هێندە روونە هیچ ووتەیەكی ناوێ.

٨- كۆئەندامی زاوزێ: ئەمیش وەك كۆئەندامەكانی تر بەهۆی باری دەرونییەوە گۆڕانكاری تیا روودەدات. هەندێ لادانی سێكسی بنەمایەكی دەرونی هەیە و تێك چوونەكانی سوری مانگانە كە دەشێ زووتر یان درەنگتر بێت هەروەها بری خوێن كەمتر یان زیاتر دەبێ، دەشێ سورەكە بە ئازار بێ. هەندێجار باری دەرونیەكە هێندە توندە دەبێتە هۆی نەمانی سووری مانگانە. لە نێرینەدا دەبێتە هۆی نەمانی ئارەزووی سێكسی، رەپ نەبوون و لە هەردوو رەگەزدا دەشێ هۆیەك بێت بۆ نەزۆكی .

كەواتە دەتوانین بڵێین جەستە و دەرون تەواوكەری یەكن و هەست بە ئازار و ناخۆشیەكانی یەكتر دەكەن، هەروەك چۆن لە كاتی شادی و خۆشیەكاندا پێكەوە سەما دەكەن.

# پەشێوی مەزاج

# (Mood disorder)

پەشێوی مەزاج بە یەکێك لە نە خۆشییە گرنگەکانی سەردەم دادەنرێت بە هۆی زۆری رێژەی تووشبوان لە لایەك و کاریگەری بەرچاوی لە سەر ژیانی تاك لە رووی کۆمەلایەتی و کارکردن و چالاکی و ئەو نەهامەتییانەی لەم نەخۆشییە دەکەونەوە لەلایەکی تر.

پەشێوی مەزاج کۆمەڵە نەخۆشیەکە لەسەرانسەری جیهان دا هەیە " مێژووی مرۆڤایەتی بێ ئەم نەخۆشییە نەبووە . بۆ یەکەم جار هیبۆکرات زاراوەی ( شادی- رەش بینی )بەکارهێنا بۆ وەسف کردنی تێکچونە دەروونییەکان" پاشان لە ساڵی ( ۱۸۹۹ ) ئیمل کرپلن وەسفی حاڵەتی ( شادی –خەمۆکی سایکۆسز )ی (-Manic Depressive Psychosis ) کردووە .

بەشێوەیەکی ئاسان دەتوانین پێناسەی پەشێوی مەزاج بکەین بەوەی کەتاك هەست بە دڵتەنگی یان شادی دەکات و ئارەزووی کەم یان زیاد دەبێ . واتە تاك باری ئاسایی خۆی لەدەست دەدات ئەم دوو بارە گەر بەتەواوی دژی یەك نەبن ئەوا لە زۆربەی نیشانەکانیاندا پێچەوانەی یەکترن دەشی هەردوو حاڵەتەش لە یەك کەسدا روبدات ماوەیەك خەمۆکی هەبێ و ماوەیەکی تر شادی تەنانەت دەشێ لە هەمان کاتدا نیشانەکانی تێکەلا بن و لە هەریەکێکیان هەندێ نیشانەی هەبێ.

رێژەی تووشبوون (Prevalence ): رێژەی توشبوون لە ژناندا دوو هێندەی پیاوان دەبێت ( لە پیاواندا ۱۰٪ و لە ژناندا ۲۵٪ ) هۆکاری سەرەکی ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ بوونی فشارێکی کۆمەلایەتی گەورە لەسەر ژنان و گۆڕانکاری ئاستی هۆرمۆن و فشاری دووگیانی و منالبوون .

خەمۆکی لە هەموو تەمەنێکدا روودەدات بەتایبەتی لە نێوان تەمەنی ( ۲۰-۵۰ ) ساڵیدا "منالٚ و بەساڵاچوانیش لەم نەخۆشییە بەدوور نین" زیاتر لەو کەسانەدا سەرهەڵدەدات کە پەیوەندییەکی لاوازیان بەچواردەورەوە هەیە" لەنێوان ژنانیشدا ژنانی تەلاق دراو وبێوەژن لە ژنانی تر زیاتر توشی خەمۆکی دەبن.

پەشێوی دوو جەمسەری کەمتر روودەدات و نزیکەی لە ١٪ دەبێت .

## هۆکارەکانی پەشێوی مەزاج: ( Causes )

١- بۆمــــاوە: رۆڵـــی بۆمـــاوە ئـــاڵۆزە و توێژینـــەوەکان ئامـــاژە بـــەوە دەکـــەن کەرێـــژەی تووشـــبوون بـــە خـــەمۆکی لـــە کەســـانی پلـــە یـــەکی نـــەخۆش دا دوو بـــۆ ســـێ هێنـــدەی کەســـانی مرۆڤێکـــی تەندروســـتە. هـــەروەها منـــاڵی دووانـــەی یـــەك هێلکـــە ئەگـــەری تـــوش بـــوونی دوومیـــان( ٥٠٪ ) ئەگەرێـــەکێکیان نەخۆشـــیەکەی هـــەبێت " ئەگـــەر مناڵەکان دووانەی دوو هێلکە بن ئەم گریمانەیە بۆ ( ١٠٪- ٢٥٪ ) دادەبەزێت.

ســـەبارەت بـــە پەشـــێوی مـــەزاجی دوو جەمـــسەری لـــە کەســـوکاری پلـــە یەکـــدا ( ١٠ ) هێندە زیاترە وەك لەکەسانی تر.

ئـــەوەی جـــێ تێبینیـــە ئەوانـــەی حاڵـــەتی خـــەمۆکیان هەیـــە کەســـوکاریان زیـــاتر توشـــی خـــەمۆکی دەبـــن نـــەك پەشـــێوی مـــەزاجی دوو جەمـــسەر بـــەڵام ئەوانـــەی پەشـــێوی مـــەزاجی دوو جەمـــسەریان هەیـــە کەســـوکاریان ئەگـــەری توشـــبونیان بـــە پەشـــێوی مـــەزاجی دوو جەمسەری وخەمۆکی زیاترە لە کاسانی تر.

هەنـــدێ توێژینـــەوە بـــاس لـــە رۆڵـــی کرۆمۆســـۆمەکان دەکـــەن لـــە گواســـتنەوەی ئـــەم پەشـــێویە بـــە تایبـــەتی کرۆمۆســـۆمی ژمـــارە ١١ و ١٨ ، بـــەڵام هەنـــدێ توێژینـــەوەی تـــر بـــە هەمان ئە نجام نەگەشتوون.

٢- ئاســـــتی وەرگـــــرە دەمارییـــــەکانی مێـــــشك: ئـــــۆرئیپنفرین: زیـــــتر لـــــە توێژینـــەوەك بـــاس لـــە کـــەمی ئاســـتی دەکـــات لـــە حاڵـــەتی خـــەمۆکی و زیـــادبوونی چـــالاکی ئـــۆرئیپینفرین لـــە شـــادیدا. بۆیـــە لـــە چارەســـەردا ئـــەو دەرمانانـــە بەکاردەهێنری کە کاریگەری هەیە لەسەر ئاستی ئەم مادەیە.

ســـیرۆتۆنین: زیـــاتر لـــە توێژینەوەیـــەك ئامـــاژە بـــە دابـــەزینی ئاســـتی ســـیرۆتۆنین و پێـــنج هایدرۆکـــسی ئینـــدۆل ئەســـیدیك ئەســـید (5HIAA) دەکـــەن بۆیـــە ئـــەو دەرمانانـــەی کاریگـــەریان هەیـــە لەســـەر ئاســـتی ســـیرۆتۆنین وەکـــو ( ســـێرترالین و فلۆکـــستین و سیتالۆپرام و پارۆکستین ) بە چارەسەرێکی گرنگ دادەنرێن بۆ خەمۆکی.

دۆپـــامین: رۆڵـــی دۆپـــامین لـــە خەمۆکیـــدا کـــەمتر روونـــە زیـــاتر لـــە حاڵـــەتی شـــادیدا بـــەرزی ئاســـتی دۆپـــامین بەدەرەکـــەوێت هەنـــدێ بەلگـــەی زانـــسیش هـــەن لەســـەر کـــەمی

ئاستی دۆپامین لە خەمۆکیدا.

١- پەیوەندیەکی روون هەیە لە نێوان خەمۆکی ئاستی کۆرتیزۆل : ئەوانەی خەمۆکیان هەیە لە ٥٠٪یان ئاستی کۆرتیزۆلیان بەرزە.

٢- هۆکاری کۆمەڵایەتی و دەروونی ( Psychological and Social Factors ):

لەدەست دانی سەروەت و سامان و کار و پیشە " یان لەدەست دانی یەکێك لە ئەندامانی خێزان یان هاورێیەکی خۆشەویست " جیابونەوەی خێزان و راگواستن و ئاوارە بوون و دەربەدەری ئەگەری خەمۆکی لەماوەی ٦ مانگی ئایندەدا شەش هێندە زیاد دەکات.

لەدەست دانی باوان پێش تەمەنی ١١ ساڵی ئەگەری خەمۆکی زیاد دەکات لە تەمەنی لاوێتیدا.

بێکاری هۆکاری توشبونە بەگەلێك نەخۆشی " ئەگەری تووشبوون بە خەمۆکی لەکەسی بێکاردا سێ هێندە زیاترە وەك لە مرۆڤی خاوەن پیشە .

١- کەسێتی: هەرچەندە هەموو کەسێ ئەگەری تووشبونی بەخەمۆکی هەیە" هەموو مرۆڤێ تا ئاستێکی دیاری کراو بەرگەی کێشەکانی ژیان دەگرێت " بەلام تێبینی کراوە ئەو کەسانەی خاوەن کەسایەتییەکی هستیری یان واسواسین زیاتر توشی خەمۆکی دەبن وەك لە کەسانی خاوەن کەسایەتییەکی دژەکۆمەڵ یان پارانۆید(Antisocial and Paranoid Personality).

٢- ئاتەوای رژێنی پەریزادە( غودەی دەرەقی ) گەر کەم دەربدرێت نیشانەکانی هاوشێوەی خەمۆکی دەبن و گەر زۆربێت نیشانەکانی هاوشێوەی شادی یان دلەراوکێ دەبێت.

٣- تەمەن: هەموو تەمەنێك ئەگەری توشبوونی هەیە بە خەمۆکی بەلام تێبینی کراوە لە چەند مانگی دوای منداڵبون و تەمەنی نائومێدی و بەساڵاچواندا ئەگەری توشبوون زیاترە.

نیشانەکانی پەشێوی مەزاج: (Sign and Symptoms) :

خەمۆکی:

١- تاك لە زوربەی کاتدا مەزاجی نییە یان مەزاجی کەمە " ئارەزووی چالاکی نییە

یان زۆر بەکەمی بەشداری چالاکی دەکات .

٢- ئــارەزووی خــواردنی کــەم دەبێتــەوە یــان ئــارەزووی نامێنێــت ، کێــشی دادەبــەزێت و هەندێ جار بە پێچەوانەوە ئارەزووی خواردنی زۆردەبێت و کێشی زیاددەکات .

٣- خــشتەی خــەوتنی تێــك دەچــێت و زۆرجــار خــەوی کــەم دەبێتــەوەو خــەوی لێناکــەوێ گــەر بخــەوێتیش خێــرا خێــرا خەبــەری دەبێتــەوە و یــان خــەوی نــاخۆش دەبینێــت و دەشــێ پــاش نوســتنی تــەواویش واهەســت بکــات کــە نەنوســتووە. بــە پێــچەوانەشەوە لــە هەنــدێکی تــردا مــاوەی خــەوتنی زیــاتر دەبێــت و ســەرەڕای نوســتن بــۆ مــاوەی پێویست هەست بە شەکەتی و ئارەزووی زیاتر دەکات بۆ خەو.

٤- لــەڕووی جەســتەییەوە زوربــەی کــات مــات و کــەم چــالاکە و هەنــدێ جــار جوڵــەی زۆر دەبێ و لەشوێنێکدا ئۆقرە ناگرێ.

٥- لەڕووی جنسیشەوە ئارەزووی کاری سێکسی نامێنێ، سوری مانگانەی تێکدەچێ.

٦- نــەمانی ووزە بــۆ کــار کردنــی و زوو هەســت بەماندوویــەتی کــردن و خێــرا شــەکەت بوون.

٧- لۆمــە کردنــی خــۆد بەشــێوەیەکی نەشــیاو و هەســت کــردن بــەگوناه وگــەورە کردنــی هەڵەکانی خۆی .

٨- کەم بونەوەی توانای بیرکردنەوە و وورىايى و لاوازی هۆشپێدان.

٩- زۆرکــات یــان هەمیــشە لایــەنی ڕەشــی یــان( ســلبی - نەگــەتیفی ) ڕووداوەکــان دەبینێــت ، نــەمانی ئومێــد و هیــوا بــە ئاینــدە و نــا ئومێــدبوون لــە چــاکبونەوە و لــەو باوەڕەدا دەبێت هیچ چارەسەرێك چاکی ناکاتەوە .

١٠- هــەروەها کەســەکە ئــارەزووی مــردن دەکــات و دەشــێ بــیری خۆکوشــتنی بەخەیاڵــدا بێت و هەوڵی خۆکوشتن بدات.

﴿ڕێــژەی خۆکوشــتن لــەو کەســانەی بەدەســت ئــەم نەخۆشــییەوە دەنــاڵن نزیکــەی( ١٥٪ )یــە" بەگــشتی لــە نێــوان ئــەو کەســانەی کــە خۆیان دەکــوژن لــە( ٣٠٪-٧٠٪ ) خــەمۆکییان هەیــە﴾ بیرمــان نەچــێ ئــەم ڕێژانــە زیــاتر لــە ئــەوروپا و ئەمــەریکاوە وەرگــیراوە بــەلام لای خۆیــان بــەهۆی بتــەوی بــاوەڕی ئاینیــەوە تــاك کــەمتر پــەنا بــۆ خۆکــوژی دەبــات. بێگومــان ئــەم نیــشانانە یــان هەنــدێ لــەم نیــشانانە بەشــێوەیەك یــا بــە شــێوەیەکی تــر کاردەکەنــە ســەر ژیــانی تــاك لــەڕووی کۆمەلایــەتی و دەروونــی و کارکردنــەوە و دەشــێ شــێوازی ژیــانی تــاك بەتــەواوی بگــۆڕێ لــەمرۆڤێکی چوســت و چــالاك و خزمەت بەخشەوە ببێتە مرۆڤێکی سست و گۆشەگیر و پشت بەستوو بەکەسانی تر.

دەبێت ئەوەش بزانین هەرکەسێك هەندێ لەم نیشانانەی هەبوو مانای ئەوە نییە نەخۆشی خەمۆکی هەیە بەڵکو بە پێی ڕابەری دەستنیشان کردن و ئامارکردنی نەخۆشییە عەقڵییەکان (Diagnostic and Statistical IV-TR) Manual of Mental Disorders دەبێ بەلایەنی کەمەوە پێنج یان زیاتر لەو نیشانانەی سەرەوەی هەبێ بۆ ماوەی زیاتر لە دووهەفتە و کاربکاتە سەر پەیوەندی کۆمەڵایەتی و توانای کارکردن " هەروەها ئەم نیشانانە بەهۆی بەکار هێنانی دەرمان یان نەخۆشی ترەوە نەبێت وەکو کەمی چالاکی رژێنی پەریزادە (Hypothyroidism).

هەروەها دەبێت خەمۆکی لە هەندێ نەخۆشی تر جیا بکرێتەوە وەکو نەخۆشی پارکنسۆنیزم کەلە( ٥٠٪-٧٥٪ ) خەمۆکیان هەیە هەروەها زۆرێك لەنەخۆشییە دەروونییەکان هەندێ لە نیشانەکانی خەمۆکیان لەگەڵدایە وەکو سکیتزۆفرینیا و دڵەراوکێ و واسواسی و پەشێوی پاش زەبر.

**نیشانەکانی شادیبوون :**

١- تاك هەست بە شادمانی دەکات و جوڵەی زۆر دەبێت زۆرجار بێ مەبەست یان بۆ هەندێ چالاکی کە پێویست ناکات .
٢- قسە زۆردەکات و دەنگی لە ئاسایی بەرزترە .
٣- لە رەفتارەکانیدا گوێ نادات بە دەوروبەرو پۆشاکی سەیرو رەنگاورەنگ لەبەردەکات و لەماوەیەکی کورتدا چەندجاری پۆشاکەکانی دەگۆڕێ بەبێ ئەوەی پێویست بکات.
٤- پارەیەکی زۆر خەرج دەکات و هەندی کەرەستەو پێداویستی دەکرێ کە پێویستی پێی نیە یان چەند دانەیەکی تری هەیە لە هەمان کەرەستە.
٥- ئارەزووی سێکسی زۆردەبێ دەشێ هەندێ رەفتاری دژە دابونەریت بە ئەنجام بگەیەنێ یان پەیوەندی هاوسەری دروست بکات یان خێزانی دووەم پێکەوە بنێ لەو ماوەیەدا هەندێ جار باوان و ئەندامانی تری خێزان هاندەر دەبن بۆ ئەم جۆرە بریارە بە بۆچوونی خۆیان ئەمە رێگە چارەیەکە بەلام لە راستیدا ئەم جۆرە بریارانە تەنها کێشەکان ئاڵۆزتر دەکات.
٦- بیرکردنەوەی خێرا دەبێت و کۆنترۆڵی خۆی پێناکری و لە هەموو بابەتێك دەدوێ و پێش ئەوەی بابەتێك تەواو بکات بابەتێکی تر دادەمەزرێنێ.

٧- زۆر بـــڕوای بـــەخۆی دەبـــێ و خـــۆی لـــە خـــەڵکی پـــێ گـــرنگترو بـــەتواناترە و هەنـــدێ جـــار وەکـــو کەســـێکی دینـــدار دەدوێ و واخـــۆی دەردەخـــات کـــە پـــەیامێکی پێیـــە دەبـــێ خـــەڵکانی تـــر شـــوێنی بکـــەون و هەنـــدی جـــار خـــۆی بـــە پێغەمبـــەر دەزانـــێ دەشـــێ لەوەش زیاتر بڕوات.

## پۆلێن کردنی پەشێویەکانی مەزاج:

١- یـــەك جەمـــسەری : نـــەخۆش تـــەنها توشـــی حاڵـــەتی خـــەمۆکی دەبێـــت و دەگەڕێتـــەوە باری ئاسایی پاش ماوەیەکی تر خەمۆکییەکەی بۆدەگەڕێتەوە .

- خـــەمۆکی گـــەورە : (Major Depression) ئەگـــەر نەخۆشـــەکە پێـــنج یـــا زیاتر لە نیشانەکانی سەرەوەی هەبوو.
- دســـسایمیا : (Dysthymia) جـــۆرێکی خـــەمۆکی ســـوکە و نیـــشانەکانی دەبێـــت بەلایـــەنی کەمـــەوە بـــۆ مـــاوەی دوو ســـاڵ بـــەردەوام بێـــت و نیـــشانەکانی ناگاتـــە ئاســـتی خـــەمۆکی گـــەورە . ڕێـــژەی توشـــبون بـــەم جـــۆرە خەمۆکییـــە نزیکـــەی( ٦٪ ) و مێ دوو هێندەی نێر توشی ئەم حاڵەتە دەبێ.

٢- دووجەمسەری :( Bipolar)

- دووجەمـــسەری جـــۆری یەکـــەم : (Bipolar I disorder) لـــەم حاڵەتـــەدا مـــەزاجی نـــەخۆش لـــەنێوان شـــادی و خەمۆکیـــدا دەبێـــت هەنـــدێ جـــار توشـــی خـــەمۆکی دەبێـــت و هەنـــدێ جـــاری تـــر توشـــی شـــادی دەبێـــت " لەنێوانیانـــدا ماوەیـــەکیش ئاســـایی دەبێـــت و نیـــشانەی نەخۆشـــی تیـــا بـــەدی نـــاکرێ . ڕێـــژەی توشـــبوون ١٪ ە هـــەردوو ڕەگـــەز وەك یـــەك توشـــدەبن. زۆربـــەی کـــات لـــە ســـەرەتای بیـــستەکانی تەمەندا نیشانەکان سەرهەڵدەدەن.
- دووجەمـــسەری جـــۆری دووەم : (Bipolar II Disorder) مـــەزاجی نـــەخۆش لـــەنێوان خـــەمۆکی و شـــادییەکی کەمـــدا دەبێـــت و هەنـــدێ جـــاریش مـــەزاجی ئاســـاییە ، بـــەوە جیادەکرێتـــەوە لـــە جـــۆری یەکـــەم کـــە نـــەخۆش هـــیچ کـــاتێ ناگاتـــە شـــادی تـــەواوەتی . ڕێـــژەی توشـــبوون ٠،٥٪ دەبـــێ و ڕەگـــەزی مـــێ زیـــاتر توشـــدەبێ وەك لـــە نێر.
- سایکلۆســـیمیا : (Cyclothymia) مـــەزاجی نەخۆشـــەکە لـــەنێوان خەمۆکییـــەکی کـــەم و شـــادییەکی کەمـــدا دەبێـــت ، ڕێـــژەی توشـــبوون ١٪ ە مێینـــە برێـــك زیـــاتر لـــە نێر توشی ئەم حاڵەتە دەبێ.

بـــە پێی پـــۆلێن کردنـــی جیهـــانی بـــۆ نەخۆشـــییەکان (ICD 10 International

Classification for Disease) خەمۆکی دەکرێت بە سێ جۆرەوە ناسان و مامناوەند و قورس بە پێی ژمارەی ئەو نیشانانەی هەیەتی بێگومان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆرێت .

**چارەسەرکردن ( Treatment) :**

١- بەشێکی زۆر لە حاڵەتەکان دەتوانرێت لە دەرەوەی نەخۆشخانە چارەسەر بکرێت لە رێی پێدانی دەرمانی تایبەت بە نەخۆشی خەمۆکی وەکو تۆفرانیل و ئەنەفرانیل یان فلوکستین و سیتالۆپرام ..... هتد.

٢- چارەسەرکردنی دەروونی لەرێی چارەسازی دەروونییەوە.

٣- چارەسەرکردنی کۆمەڵایەتی لەرێی توێژەری کۆمەڵایەتییەوە .

٤- خەواندنی نەخۆش لە نەخۆشخانە. چارەسەرکردنی بەرێگاکانی سەرەوە لەگەڵ کردنی کاری پێویست بۆ هەر حاڵەتێك کەهەبێت .

٥- بەکارهێنانی تەزووی کارەبا لەژێر بەنجی گشتیدا " هەفتەی دوو بۆ سێ جار بەتایبەتی لەو کەسانەی کە خەمۆکییەکەیان توندە و نیشانەکانی سایکۆسیان هەیەو سوود لە دەرمان وەرناگرن و هەوڵی خۆکوشتن دەدەن و خواردن ناخۆن . تەزووی کارەبا بەیەکێك لە چارەسەرە گرنگەکان دادەنرێت و رێژەی کاریگەری لە ٢٠٪ زیاترە لە بەکارهێنانی دەرمان.

٦- بێگومان بەکارهێنانی هەر رێگا چارەیەك بە پێی تایبەتمەندی حاڵەتەکەیە و بەکارهێنانی زیاتر لە رێگاچارەیەك کاریگەرترە لە تەنها رێگایەك.

٧- سەبارەت بە شادی دەرمانی دژە سایکۆس بەکاردەهێنرێت هەروەها دەرمانەکانی جێگیرکردنی مەزاج و هەندێ دەرمان و رێگاچارەی تر بە پێی پێویستی نەخۆشەکە.

٨- بەکارهێنانی دەرمانەکانی جێگیرکردنی مەزاج وەکو تگریتۆل و دیپاکین .

**ئایندەی نەخۆش ( Prognosis) :**

خەمۆکی : گەرچارەسەری گونجاویان بۆ بکرێت ئەوا( ٥٠٪ )یان لەماوەی کەمتر لەساڵێکدا چاك دەبنەوە ئەگەری سەرهەڵدانەوەی نەخۆشی یەکە بەم شێوازەیە :

١- ١٢٥٪ حاڵەتەکەیان سەرهەڵدەداتەوە لەماوەی شەش مانگدا پاش چاك بونەوە.

٢- ٣٠٪-٥٠٪ حاڵەتەکەیان سەرهەڵدەداتەوە لە ماوەی دوو ساڵدا .

٣- ٥٠٪-٧٠٪ حاڵەتەکەیان سەرهەڵدەداتەوە لە ماوەی پێنج ساڵدا.

بەشێوەیەکی گشتی هەتا ماوەی نێوان سەرهەڵدانەوەیەك و سەرهەڵدانەوەیەکی تر کەم بێت ئەوا توندی حاڵەتەکە زیاتر دەبێت و نەخۆشەکە زیاتر نائارام دەبێت .

هەتاکو حاڵەتەکە ئاسان بێت و نیشانەکانی سایکۆسزی لەگەڵدا نەبێت و ماوەیەکی کەم بمێنێتەوە ئەوە ئایندەی نەخۆشەکە باشترە " باری خێزانی و هاوکاری هاوڕێیانی و ئەندامانی خێزان کاریگەری گەورەی هەیە لەسەرچاك بوونەوەو سەرهەڵنەدانەوەی نەخۆشییەکە .

زۆر بەکەمی رودەدات تاکیك تەنها حاڵەتی شادی هەبێت بەڵکو زۆربەی جار خەمۆکی لەگەڵدایە گەر تەنها حاڵەتی شادیشی هەبێت هەر بە حاڵەتی پەشێوی مەزاجی دووجەمسەری ناودەبرێت بە بەکارهێنانی دەرمان لە ماوەیی کەمتر لە ٣ مانگدا چاکدەبنەوە بەڵام ئەگەری سەرهەڵدانەوەی زۆرە و دەبێ چارەسەر بەکاربێنێ بۆ ماوەی پێویست و لەلایەن پزیشکەوە کاتی راگرتنی دەرمان دیاری دەکرێت.

# سکیزۆفرینیـــا

# Schizophrenia

ئـەو نەخۆشـیەی لـە سـەرجەم نەخۆشـیەکانی تـر زیـاتر گفتوگـۆ هەڵـدەگرێ و تـاکو ئێـستا دەیـەها پـەرتوك لەمـەر ئـەم نەخۆشـیە نوسـراوە زانایـان زیـاتر لـە بۆچـونێکیان هەیـە لەمـەر ئـەم نەخۆشـیە. مێـژوی ئـەم نەخۆشـیە پـێ دەچـێ هێنـدەی مێـژووی مرۆڤایـەتی کـۆن بێـت کـۆنترین نوسـراو کـەباس لـەم نەخۆشیە بکـات نوسـراوێکی هیندیـە مێژوەکـەی بـۆ ١٤٠٠ سـاڵ پـێش زایـن دەگەڕێتـەوە. بـەڵام بـەم شـێوەیەی کـە ئێـستا هەیـە بـۆ یەکـەم جـار زانـای ئـەڵمانی ئـەمیل کـرپلن لـە سـاڵی (١٩٨٦ز) بـاس لـە کۆمـەڵێك نـەخۆش دەکـات کـە نیـشانەکانیان وەك ئـەم حاڵەتـە وایـەو نـاوی حاڵەتەکـە دەنـێ (خەلەفانـدنی پـێش وەخـت) ، پاشـان لـە سـاڵی (١٩١١ز) پزیـشکی سویـسری یـوگن بلولەر بۆ یەکەم جار زاراوەی سکیزۆفرینیا بەکار دێنێ.

سـکیزۆفرینیا یەکێکـە لـە نەخۆشـیە دەرونیـەکان کـە کۆمـەڵێك نیـشانەی پۆزەتیـف و نیگـەتیفی هەیـە ، پۆزەتیفـەکان وەکـو (وەهـم و هەڵوەسـە ) نەگەتیفـەکان وەکـو (قسەنەکردن، کەمی چالاکی کۆمەڵایەتی ).

## هۆکاری توشبوون بە سکیزۆفینیا :

١- بۆمـاوە: نکـوڵی لـەوە نـاکرێ کـە بۆمـاوە بـە هۆکـارێکی گـرنگ دادەنرێـت لـە نەخۆشـیە دەرونیەکانـدا رێـژەی ئاسـایی توشـبوون نزیکـەی ١٪ دەبێـت ، بـەڵام گـەر یـەکێك لـە ئەنـدامانی خێـزان ئـەم حاڵەتـەی هـەبێ ئەگـەری توشـبوونی ئەنـدامانی تـر زیـاد دەکـات بـەڵام توشـبوون حـەتمی نیـە . بـۆ نمونـە گـەر یـەکێك لـە بـاوان حاڵـەتی سـکیزۆفرینیای هـەبێ ئەگـەری توشـبوونی منداڵـەکانی لـە نێـوان ١٧٪-٢٠٪ دەبـێ گـەر هـەردوو بـاوان هـەیان بێـت ئەگەرەکـە بـۆ ٣٠٪ - ٤٠٪ بەرزدەبێتـەوە ، گـەر خوشـك یـان بـرا هـەبێت ئەگەرەکـە بـۆ ئەنـدامانی تـر نزیکـەی ١٤٪ دەبێـت ، بـۆ دوانـەی لێکـچوو گـەر یـەکێکیان حاڵەتەکـەی هـەبێت ئەگـەری توشـبوونی دووەمیـان لـە نێـوان ٤٠٪- ٦٠٪ دەبێـت. ❋ ئـەم رێژانـەی سـەرەوە رێژەیـەکی جـێگیر نیـە و بـە پێی توێژینـەوەکان دەگـۆڕێ زیـاتر لـە

توێژینەوەیەك هەیە برێك زیاتر یان كەمتر لەم ڕێژانەیان بەدی كردووە﴾.

٢- تەمــەن: زۆربــەی حاڵەتــەكان لــە تەمــەنی هەرزەكاریــدا ســەرهەڵدەدەن بــەڵام هەنــدێ جــۆری ســكیزۆفرینیا هەیــە لــە تەمــەنێكی دواتــر ســەرهەڵدەدات و ئەگــەری ڕوودانیــشی لــە منداڵیــدا نــامۆ نیــە. لــە نێرینــەدا پــێش مێینــە ڕوودەدات بــە پێچەوانەی تەنگژەكانی مەزاج.

٣- كەســێتی و پێــك هاتــەی جەســتەیی: زیــاتر لــەو كەســێتیانەدا ڕوودەدات كــە بــەوە جیادەكرێنــەوە نــاوەكین و هەســتەوەرن و لــە ڕووی كۆمەڵایەتیــەوە ســستن بــەڵام ئەگەری ڕوودانی لە هەموو جۆرەكانی كەسێتیدا هەیە.

ســەبارەت بــە پێكهاتــەی جەســتە ئەوانــەی لاوازن و زەعــیفن زیــاتر توشــدەبن وەك لەوانــەی خــڕو قەڵــەون بــەڵام ئەمــە مانــای ڕوونــەدانی ئــەم حاڵەتــە نیــە لەوانــەی جەستەیان پڕە.

٤- هۆكــاری كیمیــای ژیــانی: گۆڕانكــاری لــە ئاســتی وەرگرەكــانی مێــشك دەتــوانین گرنگترین گۆڕانكارییەكان لەم چەند خاڵەدا كۆبكەینەوە.

- بەرزبونــەوەی ئاســتی دۆپــامین كــە دەبێتــە هــۆی ســەرهەڵدانی نیــشانەكانی هەڵوەســە و وەهــم بۆیــە یــەكێك لــە ڕێگــە چــارەكان بــەكارهێنانی دەرمــانی دژەسایكۆسسە كە دەبێتە هۆی دابەزینی ئاستی ئەم وەرگرە.

ئــەوەی پاڵپــشتی ئــەم بــۆ چــوونە دەكــات ئەوەیــە هەنــدێ پێكهاتــە هەیــە وەكــو (LSD) كــە دەبێتــە هــۆی چــالاك كردنــی دۆپــامین یــان لــە كارخــستنی كــاری دەرمانــەكانی دژەسایكۆســس بۆیــە دەبێتــە هــۆی ســەرهەڵدانی هەڵوەســە بــەڵام ئــەم ڕاســتیە ناتوانێــت ڕاڤــەی ســەرجەم نیــشانەكانی ســكیزۆفرینیا بكــات چــونكە گــەر زۆرچــالاكی دۆپــامین ڕاڤــەی هەنــدێ نیــشانە بكــات ئــەوا هەنــدێ نیــشانەی تــر هەیــە بەتایبــەتی نێگەتیڤــەكان ناتوانرێــت بــەم ڕاســتیە ڕاڤــە بكرێــت. چــونكە گــەر زۆر چــالاكی دۆپــامین نیــشانە موجەبــەكان بێــت كەواتــە نیــشانە ســاڵبیەكان دەبێــت بــە كــەم چــالاكی ڕاڤــەبكرێت واتــە لەكاتێكــدا دەرمانــەكانی دژەسایكۆســس دەدەیــن بــە نــەخۆش دەبــێ حاڵەكــەی خراپتربێــت (مەبەســتمان نیــشانە ســاڵبیەكانە) بــەڵام دەبیــنین هەنــدێ نــەخۆش چــاكدەبێتەوە بــەو دەرمانانــە، ئەمــەش ئــەو ڕاســتیە دەســەلمێنێ هــیچ تیۆرێــك

نـــاتوانێ ڕاڤـــەی ســـەرجەم نیـــشانەكانی ســـكیزۆفرینیا بكـــات .بۆیـــە ڕۆڵـــی وەرگرەكـــان تـــر و تیۆریـــەكانی تـــر گرنگـــی خـــۆی هەیـــە، ڕەنگـــە ئەمـــە ڕاســـتیەكی تـــر بخاتـــە ڕوو كـــە هـــیچ نەخۆشـــێكی ســـكیزۆفرینیا ســـــەرجەم نیـــــشانەكانی نیـــــە و دەرمانـــــەكانی چارەســـــەریش سەرجەم نیشانەكان چارەسەر ناكەن.

- زیادبوونی چالاكی نۆرئەدرینالین .
- ســـیرۆتۆنین : زیـــادبونی ئاســـتی ســـیرۆتۆنین لـــە ســـكیزۆفرینیای درێژخایەنـــدا ، دابەزینی ئاستی لە حاڵەتی پارانۆید و سكیزۆفرینیای كورتخایەن.
- گۆڕانكـــاری لـــە ئاســـتی گابـــا ( گامـــا ئـــەمینۆ بیوتاریـــك ئەســـید ): لـــە ســـەرەتای حاڵەتەكەدا ئاستێكی نزم پاشان بەرزبونەوەی ئاستەكەی.
- هـــەروەها گۆڕانكـــاری لـــە ئاســـتی پرۆســـتاگلاندین و ج پـــرۆتین و ئەســـیتایل كـــۆلین و فۆسفەتیدیل كۆلین و فۆسفەتیدیل سیرین و فۆسفەتیدیل ئیسانۆلامین.

٥- بـــەرواری لـــە دایكبـــوون: ئەوانـــەی لـــە زســـتان و ســـەرەتای بـــەهاردا لـــەدایك دەبـــن ئەگـــەری توشـــبونیان زیـــاترە بـــە ســـكیزۆفرینیا بـــەهۆی هەنـــدێ هـــەوكردنی ڤایرەسیەوە وەكو ڤیرەسی كەمی بەرگری و ئیپشتیان بار ڤایرەس .

٦- ئاســـتی بـــەرگری: تێبینـــی كـــراوە ئاســـتی ئیمیونۆگلـــوبینی ( جـــی و ئـــیئم و ئـــەی ) زیاد دەكات لە كەسانی سكیزۆفرینیا.

٧- پێكهاتـــەی مێـــشك: هەنـــدێ توێژینـــەوە ئامـــاژە بـــەوە دەدەن كـــە نیـــشانە نەگەتیڤـــەكان پەیوەنـــدیان بـــە پوكانـــەوەی هەنـــدێ بەشـــی مێـــشكەوە هەیـــە بـــە تایبـــەتی بەشـــی پێـــشەوەو ســـەرەوەی مێـــشك. بـــە پێـــی ئـــەو توێژینەوانـــەی لەســـەر مێـــشكی ئەوانـــە كـــراوە كـــە ســـكیزۆفرینیایان هەیـــە پـــاش مردنیـــان دەركـــەوتووە كـــە قـــەبارەی مێـــشكیان بـــچوكترە، زیـــادبونی قـــەبارەی بۆشـــاییەكانی مێـــشك، لـــە دەستدانی هەندێ خانەی مێشك.

٨- پەیوەنـــدی خێزانـــی: پەیوەنـــدی خێزانـــی كاریگـــەری ئاشـــكرای هەیـــە لەســـەر ســـەرهەڵدان و ئاینـــدەی ســـكیزۆفرینیا تێبینـــی كـــراوە ئـــەو خێزانانـــەی ئاســـتێكی بـــەرزیان هەیـــە لـــە دەربڕینـــی ســـۆز ( زۆر ڕەخنـــەگرتن، زۆربایەخـــدان بـــە نـــەخۆش ڕێگەنـــەدان بـــە هـــیچ ئازادیـــەك ) ئەگـــەری ســـەرهەڵدانەوەی ســـكیزۆفرینیا چـــوار

هیندەی ئەو خێزانانە دەبێت کە ئاستێکی نزمیان هەیە لە دەربڕینی سۆز.

٩- ئاستی ئابووری: لە وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا تێبینی کراوە ئەوانەی سکیزۆفرینیایان هەیە زیاتر لە ئاستێکی ئابووری نزمدان ڕەنگە هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە بگەڕێتەوە ئەوانەی ئەم حاڵەتەیان هەیە بەهۆی کارنەکردن و دابرانی کۆمەڵایەتیەوە ئاستی ئابوریان دادەبەزێ نەك هەر لە سەرەتاوە ئاستی ئابووریان نزم بێت. بەڵام لە هیندستان تێبنی کراوە لە ئاستە بەرزەکاندا سکیزۆفرینیا هەیە.

## پۆلین کردنی سکیزۆفرینیا:

لە نێوان هەردوو سستمی ئەمەریکی و ئەوروپی برێك جیاوازی هەیە لە پۆلینکردندا بە پشت بەستن بە سستمی ئەمەریمی سکیزۆفرینیا دەکرێت بەم جۆرانەوە:

١- کەتەتۆنیا: دەکرێت بە دوو جۆرەوە

أ- کەتەتۆنیای بە تەختەبوون: ئەم جۆرە زیاتر بەوە جیادەکرێتەوە کە تاك گرفتی لە بواری جوڵەدا هەیەو جەستەی وەك تەختەی لێدێت ، دەتوانێت بۆ ماوەیەکی درێژ لە یەك باردا بمێنێتەوە هەندێ جار ئەو بارە بارێکی زۆر نائاساییە یان پێویست ناکات بەو جۆرە بێت بۆ نمونە گەر داوا لەهەرکەسێ بکەیت برێك دەستی بەرزکاتەوە بۆ ئەوەی لێدانی دڵی بگریت پاش ئەوەی کارەکەت تەواو کرد بەبێ ئەوەی بەکەسەکە بڵێیتەوە دەستی دادەگرێت و دەیخاتەوە باری پێشووی بەڵام گەر کەسێك ئەم بارەی هەبێت پاش تەواوبونی کارەکە دەشێت بۆ ماوەیەکی درێژ هەندێ جار چەند کاژێك لەو بارەدا دەستی بهێڵێتەوە. یان بەبێ ئەوەی پێویست بکات ماوەیەکی زۆر لەسەر پێ رادەوەستی جا شوێنەکە گونجاوێت یان نەگونجاو. ئەم بارە پێی دەڵێن بە مۆم بوون چونکە کەسەکە وەك مۆمی لێدێت و دەتوانیت لەو بارەی ئارەزوو دەکەیت پەلەکانی بوەستێنیت بەبێ ئەوەی بەرەنگاریت بکات.

ب- کەتەتۆنیای ماخۆلان (بێ ئۆقرەیی) (catatonic excitement): لەم بارەدا نەخۆش ئۆقرە ناگرێ لە هاتوچۆی بەردەوامدایە بەبێ مەبەست ، جا لە

ماڵدا بێت یان لە دەرەوە هەست بە ماندوێتی ناکات.

٢- پارانۆیـــا : (paranoid): لـــەم بـــارەدا نـــەخۆش زیـــاتر نیـــشانەکانی وەهمـــی هەیـــە بـــۆ نمونـــە وا دەزانـــێ کەســـێ یـــان کەســـانێك هـــەن دەیانـــەوێ زیـــانی پـــێ بگەیـــەنن یـــان چـــاودێری دەکـــەن دەشـــێ ئـــەو کەســـە یـــان کەســـانە کەســـە نزیکـــەکانی خـــۆی بـــن ، هەنـــدێ جـــار گومـــان پەیـــدا دەکـــات لـــە هاوســـەرەکەی یـــان لـــە خوشـــك دایکـــی بـــەردەوام لـــە مـــشتومڕدایە لەگـــەڵیان بـــەوەی داوێـــن پیـــسن و خیانـــەت دەکـــەن ، لـــە هەنـــدێ بـــاری تـــردا خـــۆی بـــە کەســـێکی گـــەورە دەزانـــێ هەنـــدێجار بانگەشـــەی پێغەمبەرایـــەتی دەکـــات یـــان واخـــۆی دەردەخـــات لـــە هـــەموو بوارەکـــانی ژیانـــدا بـــە توانایـــە و خـــۆی بـــە مامۆســـتا ، پزیـــشك ، پـــارێزەر، سیاســـی ...... هتـــد دەزانـــێ. جۆرەکـــانی وەهـــم زۆرن دەشـــێ نـــەخۆش جۆرێـــك یـــان زیـــاتری هـــەبێت. دەشـــێ لەگەڵیدا هەڵوەسەی بیستنی هەبێت.

٣- جـــۆری نارێـــك ( disorganized type): ئـــەم بـــارە بـــەوە جیادەکرێتـــەوە کـــە نەگونجانـــدی ناخـــاوتن. نـــەگونجانی یـــان نەشـــیاوی ڕەفتـــار. نەشـــیاوی وەڵام دانـــەوەی بـــۆ ڕووداوەکـــان ( لـــەکاتی باســـکردنی ڕوداوی خۆشـــدا دەشـــێ دڵتـــەنگ بێـــت یان لە کاتی ڕوداوی ناخۆشدا دەشی زەردەخەنە بیگرێ ).

٤- دیـــاری نـــەکراو :(undifferentiated): نـــەخۆش بـــڕی پێویـــست لـــە نیـــشانەی هەیـــە تـــا بلـــێین ســـکیزۆفرینیایە بـــەڵام لـــە هـــیچ کـــام لەوانـــەی ســـەرەوە ناچـــێ بۆیـــە لە هیچ خانەیەکدا جێی نابێتەوە.

٥- ســـکیزۆفرینیای مـــاوە: (residual): لـــەم جـــۆرەدا نـــەخۆش نـــە بەتـــەواوی چـــاك بۆتـــەوە ، نـــە نیـــشانەکانی بەشـــی ئـــەوە دەکـــات بـــوترێ ســـکیزۆفرینیای هەیـــە . نـــەخۆش هەنـــدێ نیـــشانەی وەهـــم یـــان هەڵوەســـەی هەیـــە بـــەڵام هەســـت بـــە نائاســـایی ئەم بارە دەکات لە دەوروبەر دانابرێت دەتوانێت ژیانی خۆی بەسەربەرێت .

## نیشانەکانی سکیزۆفرینیا :

نیـــشانەکانی ســـکیزۆفرینیا لـــە نەخۆشـــێکەوە بـــۆ نەخۆشـــێکی تـــر دەگـــۆڕێ بەشێوەیەکی سەرەکی دەتوانین بلێین کۆمەڵە نیشانەیەك هەیە لەوانە :

١- تەنگـــژەکانی هـــزر: ئـــەم گروپـــە بـــە کۆمەڵـــە نیـــشانەیەکی زۆر گـــرنگ دادەنـــرێ بـــۆ

ناسینەوەی سکیزۆفینیا.

أ- ئاڵۆزی بیرکردنەوە: لێرەدا تاك بیرەکانی تێکەڵ و چڕە، سەرەتای هەیە بەڵام کۆتاییەکەی روون نیە وەکو دەرگایەك وایە لە پشتەوەی هیچ نەبێ.

ب- نەبوونی پەیوەندی لەنێوان ڕستەکاندا: لێرەدا گوێگر لە پەیڤەکانی نەخۆش تێناگات ڕستەکانی بکەری هەیە بەبێ فرمان یان نیهادی هەیە بەبێ گوزارە واتە پێکهاتەی ڕستەکانی لەرووی ڕێزمانەوە تەواو نیە.

ت- پەرتەوازەیی: ئەم زاراوەیە کاتێك بەکاردەهێنرێ کە نەخۆش نەتوانێت پەیوەندیە سادەکانی بیرۆکەیەك پێکەوە ببەستێ.

پ- نەگونجان یان پێچەوانە: لەم بارەدا تاك باس لە رووداوێکی ناخۆش دەکات بەڵام لەگەڵیدا پێدەکەنێ یان بە پێچەوانەوە.

ج- وەستانی بیر: لەم بارەدا تاك بیری دەوەستێ و ناتوانێ بەردەوام بێت لە قسەکانی و پاش وەستانێك لە بابەتێکی نوێ دەدوێت، ئەم بارە بە خواستی تاك روونادات واتە خۆی بەرپرسیارنیە لەم بارە هەرچەندە هەندێجار هەوڵ دەدات ڕاڤەی بۆ بدۆزێتەوە.

ح- لادان: دەشێ تاك لە بیرکردنەوەیدا لە ڕێرەوی سەرەکی بیرەکانی لابدات بەڵام بەبێ وەستان.

خ- لاوازی (هەژاری بیرکردنەوە): لەم بارەدا تاك تەنها باس لە چەند بابەتێکی دیاری کراو دەکات و چەندبارە و چەندبارەی دەکاتەوە، کاڵ وکرچی بە ناوەرۆکەکانیانەوە دیارە.

د- بیرکردنەوەی سەرەتایی: لەم بارەدا تاك ناتوانێ ڕاڤەی پەندەکان بکات تەنها لە مانا روکەشەکانی بابەتەکان تێدەگات بۆ نمونە گەر پێی بلێی ﴿ئەوەیماڵەکەی لە شوشە بێت بەرد ناگرێتە ماڵی خەڵکی﴾ لە وەڵامدا دەڵێ تاکو نەشکێت.کاتێك دەڵێی مەبەستمکان چیە لەوەی ﴿پەنجەکانی دەست وەك یەك نیە﴾ دەڵێ هەندێکیان گەورەو هەندێکیان بچوك یان هەندێکیان ئەستور ئەوانی تر باریك.

٢- گرفت لە پێکهاتەی (ناوەرۆکی) بیرەکاندا: گرنگترین جیاکەرەوە تاك لەو

باوەڕەدایـــە کەسـێك یـــان کەســـانێك هـــەن چـــاودێری دەکـــەن یـــان دەیانـــەوێ زیـــانی پـــێ بگەیـــەنن یـــان بیکـــوژن ، وەهەمـــی گومـــان و خیانـــەت بەرامبـــەر بـــە ئەنـــدامانی خێـــزان و هاوســـەرەکەی لـــە زوربـــەی کاتەکانـــدا وەهەمـــەکان بێمانـــان و پێکـــەوە نـــاگونجێن دەشـــێ لـــە هەنـــدێ حاڵەتـــدا وەهەمـــەکان پێکـــەوە گـــرێ بـــدات و هاوســـۆزیەك لـــە نێـــوان وەهەمەکانـــدا هـــەبێت . نـــەبوونی وەهـــم مانـــای نـــەبوونی ســـکیزۆفرینیا نیـــە . گـــەر وەهەمـــی ســـستمی واتـــە پێکـــەوە بەســـتراو هـــەبوو بـــەبێ بـــوونی هـــیچ نیشـــانەیەکی تـــر وبـــەبێ بـــوونی گرفـــت لـــە کەســـێتی تاکـــدا حاڵەتەکـــە بـــە ســـکیزۆفرینیا دانانرێـــت بـــەڵکو بـــە حاڵـــەتی وەهـــم دادەنرێـــت.﴿وەهـــم بـــاوەڕێکی هەڵـــەی چەقبەســـتووە کـــە لـــە دەرەوەی ژینگـــەی تاکـــە واتـــە کەســـانی دەوروبـــەری هـــەمان باوەڕیـــان نیـــە و ئـــەو باوەڕەی لەگەڵ کۆمەڵگەکەیدا ناگونجێ﴾.

٣- تەنگـــژەی دەرککـــردن: دەرککـــردن دەروازەیەکـــە بـــۆ بـــیر( هـــزر) ، لـــەم بـــارەدا تـــاك هەڵوســـەی دەبێـــت واتـــە دەرك بـــە هەنـــدێ شـــت دەکـــات لـــە رێـــی هەســـتەکانیەوە بـــەبێ بـــوونی شـــتەکان ، بـــۆ نمونـــە گوێبیـــستی دەنـــگ دەبـــێ بـــەبێ بـــوونی دەنـــگ دەشـــێ دەنگـــەکان بـــە شـــێوەی فرمـــان بـــن و ئـــەرکێکی بەســـەردا بـــسەپێنن خـــراپ بێـــت یـــان بـــاش ، هـــەتا دەنگـــەکان هـــی کەســـێکی نزیـــك و خۆشەویـــست بێـــت ئەگـــەری گوێڕایـــەڵی زیـــاترە هەرچـــەندە فرمانـــەکانیش خـــراپ بـــن بۆیـــە مەترســـی ئـــەوەی هەیـــە تـــاك زیـــان بـــەخۆی یـــان چـــواردەوری بگەیـــەنێت. لـــە هەنـــدێ بـــاری تـــردا دەنگـــەکان شـــوێنکەوتەیی دەبـــن وەکـــو ئـــەوەی دەڵـــێن: فلانـــە کـــاری کـــرد، ئـــەوەتا پێدەکـــەنێ، خەریکـــە نـــان دەخوات،گاڵتـــەی پـــێ دەکـــەکارەکانی بـــە بـــێ نـــرخ هەڵدەسەنگێنن ...... هتد.

دەشـــێ هەڵوســـەی بیـــنین یـــان بەرکـــەوتن یـــان بـــۆنکردن یـــان تـــامکردن روبـــدات بـــەلام بـــە برێکـــی کـــەمتر﴿ هـــەر چـــەندە لـــە پەرتوکـــە زانـــستیەکاندا بـــاس لـــەوە دەکـــات ئەگـــەری روودانـــی هەڵوســـەی بیـــنین لـــە ســـکیزۆفرینیادا زۆر کەمـــە بـــەلام ئـــەوەی مـــن تێبینـــیم کـــردووە لەســـەر ئەوانـــەی نەخۆشـــی ســـکیزۆفرینیایان هەیـــە ئـــەم جـــۆرە هەڵوســـەیە گـــەر زۆر نەبێت کەم نیە﴾.

٤- گرفتـــی مولکـــداری بیرەکـــان: هەنـــدێ تـــاك لـــەو باوەڕەدایـــە کـــە ئـــەو بیرانـــەی

هەیەتی هی خۆی نیە بەڵکو هی کەسانی ترەو لە مێشکیدا چێنراوە ، یان لەو باوەڕەدایە بیروبۆچوونەکانی لە لایەن کەسان و دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە دزراوە و پەخش دەکرێ.

٥- گرفتی سۆزداری: تاك بەوە جیادەکرێتە کە لە رووی کۆمەڵایەتیەوە ستەو حەز بە تێکەڵی کۆمەڵ ناکات و تەنانەت پەیوەندیەکی سارد لە نێوان پزیشك و نەخۆشدا دەبێت پێچەوانەی حاڵەتەکانی تر کە پەیوەندیەکی گەرم وگورە .

لەسەرەتای حاڵەتەکەدا نەخۆش زۆرجار ناتوانێ وەسفی حاڵەتی سۆزداری خۆی بکات باس لەوە دەکات لە هەمان کاتدا هەمان تاکی خۆشدەوێ و رقیشی لێیەتی .

ناجێگیری پەیوەندی بە دەوروبەرەوە و گۆڕانکاری لەو پەیوەندیە بە ئاڕاستەی پێچەوانە بەبێ بوونی هۆکارێکی ئاشکرا.

نەگونجانی سیماکانی روخساری لەگەڵ ئەو ژینگەیەی کە تێیدایە بۆ نمونە دەشێ لە پرسەدا پێبکەنێ یان زەردەخە بکات بەبێ بوونی هۆکارێکی روون یان لە کەشێکی پڕ شادیدا ماتەمینی دایگرێ.

٦- گرفتی ئیرادە و جوڵە و فرمان: بێگومان بۆ بە ئەنجام گەیاندنی هەر کارێك پێویستمان بە بڕیاردان هەیە ، یەکێك لە نیشانەکانی سکیزۆفرینیا نەبوونی ئیرادەیە، وەکو ئەوەی خوێندکارێك چەند ساڵێك لە تەمەنی خۆی دەفەوتێنێ بۆ ئەوەی قۆناغی شەشی ئامادەیی تەواو کات بەڵام خشتەیەکی وانە خوێندنی خەیاڵی بۆ خۆی داناوە بە هیچ جۆرێ بۆی پەیرەو ناکرێ ، ساڵ بە ساڵ برگەی زیاتر و زیاتر بۆ وانە خوێندنەکەی زیاد دەکات بەڵام بێ هودە تا لە کۆتاییدا بۆت دەردەکەوێ نەخۆشی سکیزۆفرینیای هەیە.

جۆرێکی تر لەنەمانی ئیرادە نەخۆش گوێرایەڵی تەواو نیشان دەدات بۆ هەرفرمانێ کە پێی بسپێرن هەرچەندە پێپاسا و سەیریش بێت. یان پێچەوانەی فرمانەکان کاردەکات پێی دەڵێن نەگەتیڤیزم.

هەندێجار جەستەی وەك مۆمی لێدێت و پشکنەر دەتوانێت بە ئارەزوی خۆی چۆن بیەوێت پەلەکانی ڕاگرێت. (Waxy flexibility) هەندێجار ئەم رەقبوونە دەگاتە ئاستێ بەستن پێی دەڵێن لە هۆشخۆچوون.

هەندێجار ووشەی بیستراو چەندبارە دەکاتەوە بەبێ هیچ هۆیەك بەبێ ماندوو بوون (echolalia) . یان ڕەفتاری بینراو چەندبارە دەکاتەوە ڕەفتاری پزیشك بێت یان کەسێکی تر.(echopraxia).

٧- هەندێ نیشانەی گشتی: تێکچوونی سیماکانی کەسێتی تاك و دابرنی لە کۆمەڵ و نەتوانینی بەردەوام بوون لە کارو پیشەو گرفت لە پەیوەندی خێزانی و توندوتیژی بێ هۆ ،ڕەفتاری نەشیاو و نابەجێ کە لەگەڵ تایبە تمەندیەکانی کەسێتی ئەودا ناگونجێ.

گوێنەدان بە پاك و خاوێنی و خۆ ڕێکخستن (گەر پیاو بێت ریش نەتاشین بۆ مێینە قژ دانەهێنان و خۆ جوان نەکردن بۆ هەردووکیان خۆنەشتن و خۆ نەگۆڕین ).

ئەوەی جێی ئاماژەیە هیچ نەخۆشێك نیە لە هەمان کاتدا سەرجەم ئەم نیشانانەی هەبێ بەڵام بەهۆی ئەوەی نەخۆشی سکیزۆفرینیا نەخۆشیەکی درێژ خایەنە دەشێ لە ماوەی تەمەنی نەخۆشدا زۆربەی نیشانەکان بەدەربکەون و مەرج نیە هەموو جارێ هەمان نیشانەی هەبێ بەڵکو لە جارێکەوە بۆ جارێکی تر نیشانەکان دەگۆڕێ ڕەنگە هەمان نیشانەی جاری پێشوی هەبێ بە هەندێ نیشانەی زیاترەوە یان نەمانی هەندێ نیشانەو سەرهەڵدانی هەندێکی تر.

مەرجەکانی دەست نیشان کردن:

بە پێی مانوەلی دەستنیشانکردن و پۆلێنکردنی نەخۆشیە دەرونیەکان دەبێت تاك ئەم مەرجانەی خوارەوەی هەبێت تاکو بڵێین سکیزۆفرینیای هەیە

١- لایەنی کەم دووان لەمانەی هەبێت بۆ ماوەی مانگێك یان زیاتر:

- هەڵوەسە.
- وەهم.
- ڕەفتاری نەگونجاو یان بەتەختەبوون.
- قسەی نارێك و نەشیاو.
- بوونی نیشانە نەگەتیفەکان وەکو دابرانی کۆمەڵایەتی ، نەتوانینی دەربرنی شادی، هەژاری (لاوازی) پێکهاتەکانی بیر ، هەژاری (لاوازی) پێکهاتەکانی ئاخاوتن.

تەنها یەکێك لەوانەی سەرەوە بەسە گەر وەهمەکە بازاڕی بوو یان هەڵوەسەکە لەو جۆرە بوو کە فرمان بدات بەسەر تاکدا لە رووی سلوکی یان لە بیرکردنەوەدا یان دوو دەنگ یا زیاتر هەبوو پێچەوانەی یەکتر بوون.

١- ئەم نیشانانە بە ئاشکرا کار بکاتە سەر توانای کارکردن و پەیوەندی کۆمەڵایەتی .

٢- ئەم نیشانانە لایەنی کەم شەش مانگ بخایەنێ گەر بەشێوەیەکی لاوازیش بێت.

٣- هۆکاری ئەم نیشانانە نەگەڕێتەوە بۆ نەخۆشی جەستەیی یان مادەهۆشبەکان.

٤- نیشانەکانی پەشێوی مەزاج یان سکیزۆی مەزاجی (schizoaffective disorder)جیابکرێتەوە واتە ئەم دوو حاڵەتە نەبێت.

تێبینی: گەر ئەم نیشانانە مانگێك کەمتری خایاند پێی دەوترێ سایکۆسی کورتخایەن ، گەر لە نێوان مانگێك بۆ شەش مانگی خایاند پێی دەڵێن پەشێوی سکیزۆفرینیفۆرم (سکیزۆی بچوك) گەر شەش مانگ زیاتر بخایەنێت پێی دەڵێن سکیزۆفرینیا.

**چارەسەرکردن:**

وەك چۆن لێدوان لەمەر سکیزۆفرینیا کارێکی ئاسان نیە چارەسەرکردنیشی نەك کارێکی ئاسان نیە بەڵکو کارێکی گرانە پێویستی بە هاوکاری پتەوی نێوان پزیشك و خێزانی نەخۆش و چارەسازی دەروونی و توێژەری کۆمەڵایەتی و بەڕێوەبەری حاڵەت و دەرمانی باش و پزیشکی شارەزا هەیە.

١- چارەسەری ڕێگری: بەوەی ژنهێنان و پێکهێنانی هاوسەرگیری لە نێوان کەسانی سکیزۆفرینیادا کەم بکرێتەوە گەر ژیانی هاوسەریشی پێکهێنابوو سنووردارکردنی منداڵبوون .

٢- بەکارهێنانی دەرمان: بە تایبەتی دەرمانەکانی دژەسایکۆس و هەندێجار دەرمانەکانی دژەدڵەراوکێ و زۆرجار وا پێویست دەکات دەرمانەکانی جێگیرکردنی مەزاجیش بەکاربهێنین. بیرمان نەچێ دەبێ کەمترین بڕو باشترین جۆر و ناوبەناو بەکاریبهێنین تاکو کەمترین کاریگەری لابەلایی ڕوویدات.

٣- چارەسەرکردن بە تەزووی کارەبا : یەکێکی تر لەو چارەسەرانەی بەکاردەهێنرێ بۆ نەخۆشانی سکیزۆفرینیا تەزووی کارەبایە ، دیارە بەکارهێنانی ئەم رێگە چارەسەرە نە بۆ زیان گەیاندنە بە نەخۆش نەبۆ ترساندنێتی ( بەداخەوە هەندێ خێزان و کارمەند و پزیشك زۆرجار نەخۆش بەوە دەترسێنن گەر فلانە کار نەکەی کارەبات بۆ دەکەین گەر وا بلێی کارەبات بۆ دەکەین ) لە ڕاستیدا کارەبا بۆ پاراستنی سەلامەتی نەخۆش وکەس وکاری بەکاردێت لەو کاتانەی نەخۆش مەترسی ئەوەی هەیە زیان بە خۆی یان کەس وکاری بگەیەنێت. سەرەڕای بەکارهێنانی دەرمان حاڵەتەکەی بەردەوامی هەیە، ناتوانێت دەرمان بەکاربهێنێت لەبەر هەرهۆیەك یان ڕازی نابێت دەرمان بەکاربهێنێت.

لە حاڵەتی سکیزۆفرینیادا زیاتر بۆ ئەو بارانە بەکاردێت کە هاوشانە لەگەڵ خەمۆکیەکی توند ، سکیزۆفرینیای بە تەختەبوون (catatonia) .

لە زوربەی کاتدا بەکارهێنانی تەزووی کارەبا زیانی کەمترە لە بەکارهێنانی دەرمان بە بڕێکی زۆر.

١- چارەسەری دەرونی : پاڵپشتی دەرونی هاوشان لەگەڵ ڕاهێنانەومو چارەسەری کیمیاوی دا سودی زۆری هەیە ، بەکارهێنانی چارەسەری دەرونی چڕو قوڵ بۆ ماوەی درێژ خایەن دەرکەوتووە لە هەندێ حاڵەتدا سوودی زۆری هەیە بەلام کاتێکی زۆری دەوێ و پارەیەکی زۆر و ناتوانرێت بۆ سەرجەم نەخۆشەکان پیادەبکرێت. سەبارەت بە شیکردنەوەی دەرونی ( ئاخاوتنی ئازاد ) نەك تەنها سودی نیە بەڵکو دەشێ زیان بە نەخۆش بگەیەنێت.

٢- کۆمەڵگەی چارەسەری: لەم بارەدا تاك دەگوێزرێتەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی بچوکتر کە زیاتر لێکتێگەیشتن و هاوکاری و گونجاندن هەبێت.ماوەیەکی دیاری کراو لەو ژینگە نوێیە دەمێنێتەوە وەکو پشویەك وایە لە ژینگە گەورەکەی لەو ماوەیەدا هەموو جۆرەکانی چارەسەری بۆ دەکرێت بە پێی پێویست پاشان دەگەڕێنرێتەوە بۆ کۆمەڵگە .

٣- چارەسەرکردن بە پیشە : ئەم جۆرە چارەسەرە کاریگەری ئاشکرای خۆی هەیە مەبەست لەم چارەسەرە تەنها پڕکردنەوەی کات نیە بەڵکو دەبێ کارێکی بە

سوود بێ و نەخۆش بەرهەمی کارەکەی ببینێ تاکو هەست بە گرنگی خۆی بکات و ببێتە پالنەر بۆ کاری باشترو چاکتر. بۆ نمونە گەر نەخۆش مێینە زیاتر بەکاری دەست خۆی خەریك دەکات پاشان بەرهەمی کارەکەی لە پێشانگایەکدا دەفرۆشرێت. نەخۆشی نێرینە زیاتر بەکاری باخەوانی و دارتاشی و ئاسنگەریەوە خەریك دەبێ. وێنە کێشان و وەرزش و بەشداری شانۆ بۆ هەردوو رەگەز جۆرێکە لە چارەسەر.

٤- چارەسەری سلوکی ومەعریفی: بۆ راستکردنەوە و هاندانی هەندێ رەفتاری گرنگ، بۆ بایەخدان بە خۆی و خۆگونجاندن لەگەڵ دەوروبەردا، چارەسەری مەعریفیش بۆ رێکخستنەوەی ئاخاوتن و رێگرتن لە پەرتەوازەیی هزر.

٥- راهێنانەوە: بە یەکەم چارەسەر دادەنرێت بۆ نەخۆشانی سکیزۆفرینیا شان بەشانی چارەسەرەکانی تر رۆڵی کاریگەری هەیە لە گەڕاندنەوەی نەخۆش بۆ ناو کۆمەڵگە.

## ماکەکانی سکیزۆفرینیا:

١- لەرووی کۆمەڵایەتی: ئەوانەی حاڵەتی سکیزۆفرینیایان هەیە پەیوەندی کۆمەڵایەتیان لاوازە تەنانەت پێش سەرهەڵدانی حاڵەتەکەش ژمارەیەکی کەم هاورێیان هەیە لە ژمارەی پەنجەی دەستێك تێپەر ناکات لە کاتی حاڵەتەکەدا ئەو بڕە پەیوەندیەش بەرەو لاوازبوون دەروات توشی گۆشەگیری دەبێت بەتایبەتی ئەوانەی نیشانەی نێگەتیڤیان هەیە.

٢- تەواونەکردنی قۆناغەکانی خوێندن: سەرەڕای بوونی ئاستی ئاسایی زیرەکی هەندێجار سەرو زیرەکی ئەوانەی نەخۆشی سیکیزۆفرینیایان هەیە ناتوانن قۆناغەکانی خوێندن بەسەرکەوتووی تەواوبکەن گەر نەخۆشیەکە لە سەرەتای تەمەنەوە سەرهەڵبدات. ( رێژەیەکی زۆر کەمیان نەبێت ).

٣- نەتوانینی کارکردن: کارکردن بەیەکێك لە خاڵە باشەکان دادەنرێت بۆ ئایندەی سکیزۆفرینیا بەڵام برێکی بەرچاویان توانای کارکردنیان دادەبەزێ گرفتیان دەبێ بەتایبەتی لە کاتی دارمانی ئابوریدا ، زۆرجار وا پێویست دەکات کارێك بکەن لە خوار ئاستی زیرەکیی و بەهرەمەندی خۆیانەوە بێت.

٤- پەیوەندی سێکسی: لەبەرئەوەی ئەم حاڵەتە لەنێردا لەسەرەتای هەرزەکاریەوە سەرهەڵدەدات بۆیە نێرینە برێکی بەرچاویان ناچنە ژیانی هاوسەریەوە مێینەش برێکی دیاریان تەلاق دراون یان ژنی دووەمیان بەسەردا هاتووە چونکە حاڵەتەکە لە مێدا برێك درەنگتر دەردەکەوێت.

سەرەرای ئەمانە گرفت هەیە لە ژیانی سێکسیدا بەهۆی لاوازی وستی پەیوەندی سۆزداری لە لایەك و کاریگەری ئەو دەرمانانەی بۆ چارەسەر بەکاردەهێنرێت لە لایەکی ترەوە.

١- تاوان: هەرچەندە لای خەڵکی واباوە ئەوانەی نەخۆشی سکیزۆفرینیایان هەیە تاوان زیاتر دەکەن بەلام راستی زانستی و ئەنجامی توێژینەوەکان وانالێت بەڵکو زیاتر لەتوێژینەوەیەك ئاماژە بەوە دەدات کە رێژەی تاوان لە نێوان هەردوو گروپ نەخۆش و خەڵکی ئاسایی یەکسانە بەلام لەو شوێنانەی خزمەتگوزاری دەروونی نیە و بۆچوونی خەڵکی خراپە لەمەر نەخۆشیە دەروونیەکان هەر گرفتێك لە نێوان دوو کەس روودات گەر یەکێکیان نەخۆشی هەبێت هەمیشە بە تاوانبار تەماشا دەکرێ بۆیە گەر زیاتر لە بەندیخانەکاندا بن هۆکەی تاوانی زیاتر نیە بەڵکو نایەکسانی و زۆرداریە بەرامبەر بە نەخۆشەکان.

٢- مردنی پێشوەخت: بەهۆی خۆکوشتن (لە ماوەی ١٠ ساڵی یەکەمی دەست نیشانکردنی نەخۆشیەکە ١٠٪ یان خۆی دەکوژێت)، خێزان کوژی، نەخۆشیەکانی کۆئەندامی سوڕان و هەوکردن و شێرپەنجە بەهۆی زۆر جگەرە کێشانەوە.

٣- هەژاری: بە پێی هەندێ سەرژمێری سکیزۆفرینیا لە چارەکی خوارەوەی ئابووی هەشت هێندەی چارەکی سەرەوەی ئابووریە. رەنگە هۆیەکی ئەوەبێت لە هەژاردا زیاتر روودات بەلام بیرمان نەچێ ئەوانەی سەرەوەش پاش ماوەیەك لە نەخۆشیەکە دێنە چارەکانی خوارەوە.

٤- هاوشانی نەخۆشیەکانی تر: ئەگەری رووداني دڵەراوکێ و خەمۆکی و واسواسی زیاترە وەك لە کەسانی تر.

**ئایندەی نەخۆش :**

یەکێك لەو پرسیارانەی کەسوکاری نەخۆش لە پزیشکی دەکەن ئەوەیە ئایا نەخۆشەکەمان چاك دەبێتەوە ؟ ئایا لە ئایندەدا چی بەسەر دێت؟

بۆ وەلامی ئەم پرسیارە دەتوانین ئایندەی باش وخراپی نەخۆش بەم خشتەیە وەلام بدەینەوە:

| ژ | ئاماژەیە بە ئایندەی باش | ئاماژەیە بە ئاندەی خراپ |
|---|---|---|
| ١ | لە کاتێکی درەنگی تەمەندا سەرهەلدەدات | لە سەرەتای تەمەندا ( سەرەتای هەرزەکاری ) |
| ٢ | سەرەتایەکی توند( لە ماوەیەکی کورتدا نیشانەکان دەردەکەون ) | سەرەتایەکی لەسەرخۆ ( پلە بە پلە نیشانەکان دەردەکەون ) |
| ٣ | ناوبەناو دەردەکەوێت ( لە هەندێ کاتدا نیشانەکان دیارنامێنن ) | نیشانەکان بەردەوامن |
| ٤ | لە پێش سەرهەلدانی نەخۆشیەکە خاوەن کەسێتیەکی سەرکەوتوو و گەرم گورە لە رووی سۆزداری و کۆمەلایەتیەوە. | پێش سەرهەلدانی نەخۆشیەکە کەسێتیەکی لاواز و هەستەوەر و گۆشەگیرە. |
| ٥ | نەبونی کەسێکی تر لە ئەندامانی خێزان کە حالەتی سکیزۆفرینیای هەبێت. | بوونی حالەتی هاوشێوە لە خێزانەکەدا. |
| ٦ | بوونی هۆکارێکی روون ( ئاشکرا ) کە بۆتە هۆی سەرهەلدانی حالەتەکە. | نەبوونی هۆکارێکی روون ( ئاشکرا ) کە ببێتە هۆی سەرهەلدانی حالەتەکە. |
| ٧ | بوونی نیشانە پۆزەتیفەکان وەکو هەلوسە و وەهم. | بوونی نیشانە نەگەتیفەکان نەبوونی ئیرادە و دابڕان لە کۆمەلْ و لاوازی ئاخاوتن. |

| ٨ | پاراستنی پەیوەندی و هاوسۆزی کۆمەڵایەتی. | لە دەستدانی پەیوەندی و هاوسۆزی کۆمەڵایەتی. |
|---|---|---|
| ٩ | بوونی هاوسۆزی و پاڵپشتی خێزانی . | نەبوونی ئەو هاوسۆزی و پاڵپشتیە. |
| ١٠ | زوو چارەسەرکردن. | دواخستنی چارەسەر. |
| ١١ | وەرگرتنی چارەسەری پێویست لە دەرمان و چارەسەری دەرونی و ڕاهێنانەوەی نەخۆش بۆ کۆمەڵ. | وەرنەگرتنی چارەسەر یان تەنها بایەخدان بە جۆرێك لە چارەسەر بەبێ گوێ دانە ڕێگاکانی تری چارەسەر. |

بە پێی توێژینەوەکان لە ٩٠٪ی نەخۆشانی سکیزۆفرینیا دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ ناو کۆمەڵگەو ژیانی خۆیان بەسەربەرن. هەندێ سەرچاوەی تر ئاماژە بەوە دەدات لە ٥٠٪یان هەوڵێ خۆکوشتن دەدەن بەتایبەتی لە کاتی خەمۆکی و بوونی هەڵوەسەی بیستن نزیکەی لە ١٠٪ یان هەوڵەکەیان سەردەگرێت.

# بەشی شەشەم:

## پەشێوی دڵەڕاوکێ

دڵەڕاوکێی گشتی

حاڵەتی تۆقین

ترسی کۆمەڵاتی

ترسی تایبەت

ئەگۆرەفۆبیا

واسواسی

پەشێوی پاش زەبری دەرونی

# پەشێوی دڵەراوکێ

# Anxiety disorder

**پۆلێن کردن:**

**گەلێك پۆلێن کردن هەیە بۆ حاڵەتی دڵەراوکی ئاسانترینیان ئەمەی خوارەوەیە**

**١- دڵەراوکێی بەردەوام : حاڵەتی دڵەراوکێی گشتی.**

**٢- دڵەراوکێی ناوبەناو: ئەمیش دەکرێت بە سێ جۆرەوە.**

**٣- پەیوەندی نیە بە بارێکی دیاری کراوەوە: حاڵەتی تۆقین.**

**أ- پەیوەنـــد دارە بـــە بـــارێکی دیـــاری کـــراوەوە: حاڵـــەتی تـــرس ، ئـــەمیش (تـــرس) دەکرێت بەسێ جۆرەوە:**

- **ترسی کۆمەڵایەتی.**
- **ترسی تایبەت یان دیاری کراو یان ترسی سادە.**
- **ئەگۆرەفۆبیا.**

**ب- لەهەردوو بارەکە روودەدات: حاڵەتی تۆقین کەهاوشانە لەگەل ئەگۆرەفۆبیا.**

**هەنـــدێ سەرچـــاوە هـــەردوو حاڵـــەتی عەمـــەلی (واسواســـی) و زەبـــری دەرونـــی پـــاش فـــشار لەم بەشەدا پۆلێن دەکەن.**

# دڵەراوكێی گشتی

## Generalized anxiety disorder

بریتیە لە ترسێكی نائاسایی كە ناگونجێ لەگەڵ هیچ وورووژێنەرێكی دەرەكیدا.

نزیكەی ١٠٪-١٥٪ ی ئەوانەی سەردانی پزیشك دەكەن حاڵەتی دڵەراوكێیان هەیە ئەوانەی لە نەخۆشخانە دەخەوێنرێن نزیكەی لە ١٠٪ یان ئەم حاڵەتەیان هەیە.

بە پێی نیۆگرۆشل و دوك نزیكەی ١٩ ملیۆن هاوڵاتی حاڵەتی دڵەراوكێیان هەیە، بە پێی هۆفلەر و ستین و هاورێكانیان زیاتر لەو كەسانەدا روودەدات كە جگەرەكێشن و لەخوار تەمەنی ٤٥ ساڵیەوەن و جیابونەتەوە یان تەلاق دراون و ئاستی كۆمەڵایەتیان نزمە. رێژەی توشبوون نزیكەی لە ٣٪ و مێینە زیاتر توشدەبێ وەك لە نێرینە.

**نیشانەكانی:**

نیشانەكانی دڵەراوكێ سەرجەم كۆئەندامەكانی لەش دەگرێتەوە برێكی زۆری ئەو حاڵەتانەش كە لەم بەشەدا باس دەكرێت برێكی زۆر لە نیشانەكانیان هاوشێوەن بەڵام جیاوازیش هەیە لە كاتی سەرهەڵدان، بڕی توندی نیشانەكان، چۆنێتی دەستپێكردنی نیشانەكان، ماوەی مانەوەی نیشانەكان.

كۆئەندامی سوڕان: دڵەكوتێ، خێراڵێدانی دڵ، سنگ ئێشە، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، كۆئەندامی هەناسە: نارەحەتی هەناسەدان، هەستكردن بە خنكان، هەناسەكوتێ، هەستكردن بە بوونی شتێك لە گەرودا، كۆئەندامی هەرس: دەم ووشكبوون، دڵتێكەڵهاتن، دڵەسوتێ، ژان و پێچ لە ریخۆڵەكان. نەمانی ئارەزووی خواردن، سكچوون، ڕشانەوە.

كۆئەندامی دەمار: مێرولەكردن، سڕبوونی دەمارەكان، لەرزین، بێخەوی، رەقبوونی ماسولكەكان، لاوازی گشتی، لەرزینی پێلوی چاو (چاوفرین)، زیادبوونی پەرچەكرداری دەمارەكان لە كاتی پشكنیندا.

كۆئەندامی میز: میزەچوركێ، زووزوومیزكردن.

پێست: سووربونەوەی روخسار (بەرزی فشاری خوێن) یان كاڵ بونەوەی ڕەنگ

( دابەزینی فشاری خوێن ) ،عەرەقکردنەوە هەموو لاشە بەتایبەتی ناودەست،گەرم داهاتن یان سارد داهاتن، خوراندن.

چاو: کشانی بیلبیلەی چاو. نیشانە دەرونیەکان: زووتورەبوون ، کەمبونەوەی تەرکیز کردن ،کەمبونەوەی هۆشپێدان،بیرچونەوە،ترسان، بە ناگابوون، راچەڵەکین،هەستکردن بە گۆڕانی دەوروبەر،هەستکردن بە گۆڕانی خود،شڵەژان،نەتوانینی زاڵبوون بەسەربیرکردنەوەدا،جامبوون،ترسان لەوەی کۆنترۆڵی خۆی لەدەست بدات،ترس لە نەخۆشی دەرونی ، ترسان لە مردن،دووبارەبونەوەی بیری تارسناك،دووره پەرێزی لە رووداوەکان،گرفت لە ناخاوتندا تەتەلەکردن،بێئارامی .

تێبینی: زۆرگرنگە پزیشك کاتێك نەخۆش سەردانی دەکات ئەو حاڵەتانە جیابکاتەوە کەدەبێتە هۆی دڵەراوکێ چونکە گەلێك نەخۆشی جەستەیی هەیە نیشانەکانی هاوشێوەن لەگەڵ دڵەراوکێدا لەهەمان کاتدا کاتێك پزیشکی هەناوی دڵنیابوو ئەم نەخۆشە حاڵەتێکی هەناوی یان نەخۆشی جەستەیی نیە پێویست ناکات بە پشکنینی زیادە پارە بە نەخۆش سەرف بکات و بەردەوام هاتوو چۆی پێبکات لەبری چاکبونەوە زیاتر توشی دڵەراوکێ بکات.

گرنگترین ئەو نەخۆشیانەی برێك لە نیشانەکانیان هاوشێوەی دڵەراوکێن.

١- کۆئەندامی سوڕان: نەخۆشیەکانی دڵ ( رەقبونی دیواری دڵ ) و زمانەی دوانەی دڵ.

٢- کۆئەندامی هەناسە: رەبو، نەخۆشی درێژخایەنی داخرانی بۆریەکانی هەناسە.

٣- کۆیرە رژێنەکان: زۆری یان کەمی چالاکی پەریزادە رژێن( غودەی دەرەقی )، دابەزینی ئاستی شەکر لە خوێندا، دابەزینی ئاستی کالیسیۆم، نیشانەی کوشین.

دوەرەم: وەرەمی پەنکریاس ، فیوکرۆمۆسایتۆما.

١- کۆئەندامی دەمار: پەرکەم لە لاجانگە بەشی مێشکەوە بێت.

٢- هەوکردن: نەخۆشی سیل، تای ماڵتە.

٣- گرفتــی پەیوەنــدار بــە دەرمــان و مادەهۆشــبەرەکان: ســەرەتای وازهێنــان لــە مــەی خواردنەوە ،حەبی خەواندن.مادەهۆشبەرەکانی تر.

لەبــەر ئــەم هۆیانــەی ســەرەوە پێویــستە پزیــشك بــەووردی پرســیاری تــەواو لــە نــەخۆش بکــات و کــاتی پێویــستی بــداتێ تــاکو بــە هەڵــەدا نەچــێ لــە دەستنیــشانکردنی حاڵەتەکــەدا ئەمــە لــە لایــەك لــە لایــەکی تــرەوە پزیــشك پێویــستی بــە کــاتێکی تــەواوە تــاکو نــەخۆش هێــور بکاتــەوەو سروشــتی حاڵەتەکــەی بــۆ بــاس بکــات وهەنــدێ ڕێنمــایی بداتێ تاکو بزانێت چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ حاڵەتەکەیدا بکات.

هەنــدێ دەرمــان هەیــە لــەکاتی بەکارهێنانیانــدا هەنــدێ نیــشانە دروســت دەکــەن کــە هاوشێوەی نیشانەکانی دڵەراوکێن:

- دەرمانەکانی دژەفشاری خوێن و دژە نارێکی لێدان دڵ.
- دەرمانەکانی بۆری هەناسە: دەرمانە کشێنەرەکانی بۆری هەناسە.
- دەرمانەکانی دژە پەرکەم یان دژە پارکینسۆنیزم.
- دەرمانەکانی دژەخەمۆکی ،دژەسایکۆسس.
- هەنــدێ دەرمــانی دژەزینــدە( ئــەنتی بایۆتیــك )، دەرمانــەکانی چارەســەری نەخۆشــی شێرپەنجە.سایرۆکسین.

## هۆکارەکان:

١- بۆمــاوە: ئەگــەر یــەکێك لــە ئەنــدامانی خێــزان ئــەم حاڵەتــەی هــەبێت ئەگــەری توشــبوونی ئەنــدامانی خێــزان بــە پێــنج هێنــدە زیــاد دەکــات.( لــە ١٥٪ )، لــە دووانــەی یــەك هێلکــەدا گــەر یــەکێکیان حاڵەتەکــەی هــەبێ ئەگــەری توشــبوونی دووەمیان لە ٥٠٪یە.

٢- پــەروەردەکردنی منــداڵ: بێگومــان پــەروەردەکردنی منــداڵ کاریگــەری گــەورەی هەیــە لــەوەی لەئاینــدەدا زیــاتر توشــی حاڵــەتی دڵــەراوکێ ببێــت وەکــو ئــەوەی بــاوان زیــاتر لــە پێویــست توانــاو چــالاکیەکانی منــداڵ ســنورداربکەن یــان هــیچ ســۆز و خۆشەویستیەکی بۆ دەرنەبرن . پێشوەخت لەشیر برینەوە.

٣- تێکــچونی ئاســتی وەرگرەکــانی مێــشك : دابــەزینی ئاســتی گامــا ئــەمینۆ بیوتاریــك ئەسید و سیرۆتۆنین هەروەها بەرزبونەوەی ئاستی نۆرئیپینیفرین.

٤- زۆر بەکارهێنانی قاوە ، کەمی فیتامین بی ١٢ ، نزم بونەوەی یان بەرزبونەوەی ئاستی شەکر، تێکچونی لێدانی دڵ، زۆرچالاکی رژێنی پەریزادە، کەم خوێنی ، هەندێ حاڵەتی تر ﴿لەم بارەدا دەبێ بەشوێن چارەسەری نەخۆشییەکەدا بگەرێن﴾.

٥- فشار: جا فشاری ئابووری بێت یان کۆمەڵایەتی یان سیاسی فشارەکە بە شێوەیەکی بەردەوام بێت یان ناوبەناو وەکو ئەوەی لە ماوەی تاقیکردنەوەدا ژمارەیەکی زۆری خوێنکار هەست بە دڵەراوکێ دەکات بە نەمانی وەرزی تاقیکردنەوەکان دڵەراوکێیەکەیان نامێنێ.

تێبینی: هەندێ لە سەرچاوەکان دڵەراوکێ دەکەن بە دوو جۆرەوە بەسود و بێ سوود (زیان بەخش) دەڵێن هەر کاتێ دڵەراوکێ ببێتە هۆی ئەوەی هەڵسیت بەکارێ سود بە خۆت بگەیەنیت و هەوڵێ چارەسەری کێشەکە بدەیت ئەوە بەسوودە هەرکاتێ ئەوەی پێی هەڵدەستیت بێ سوود بێ بە جۆری دووەم ناودەبرێت بۆ نمونە خوێندکار گەر ترس و دڵەراوکێکەی وای لێبکات زیاتر بخوێنێ و خۆی ماندوو بکات بەسوودە بەڵام دایکێک کورەکەی یان یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەی درەنگ دەگەڕێنەوە بەردەوام بە ناوماڵدا هاتوچۆ دەکات بەبێ ئەوەی هیچ بکات دەڵێ دەستم ناچێتە هیچ کارێ ئەمەیان جۆری بێ سوودە.

**چارەسەرکردن:**

١- دانیشتن لەگەڵ نەخۆش بۆ روون کردنەوەی سروشتی حاڵەتەکەی .

٢- گەر پێویستی کرد و نەخۆش حەزی کرد گفتوگۆکردن لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی سەبارەت بە حاڵەتی نەخۆشیەکە.

٣- هەندێ رێنمایی دەروونی وەکو هەناسەدان بە قوولی و راهێنانەکانی خۆخاوکردنەوە فێری نەخۆش بکرێ تاکو زاڵبێت بەسەر حاڵەتەکەدا .

٤- فێرکردنی نەخۆش بەوەی پەیڤی جوان بەخۆی بڵێ و هەندێ دیمەنی جوان بێنێتە بەرچاوی خۆی تاکو هەست بە ئارامی بکات.

٥- گەر هەر حاڵەتێکی دەروونی تر وەکو خەمۆکی هەبوو بە پێی پێویست چارەسەر بکرێت.

٦- گـران بـه دوای هـەر کێشەیەك یـان گرفتێـك کـه نـەخۆش هەیـەتی هەوڵـدان بـۆ چارەسـەرکردنی لـەرێی نـەخۆش خۆیـەوە ، خێـزان، هاورێکـانی ، توێـژەری کۆمەڵایەتی، چارەسازی دەرونی.

٧- ئـەو بابەتانـەی نـەخۆش گـرفتی هەیـە بەرامبـەری هـەوڵ بـدرێت ریزبەنـد بکـرێ یەکەیەکـە، پاشـان هـەوڵی چارەسـەریان بـۆ بـدرێ هـەر هێنـدەی توانیمـان کلیلـی یـەك گرفـت بکەینـەوەو چارەسـەری بکـەین، ئـیتر نـەخۆش فێردەبـێ گرفتـەکانی تـر خـۆی چارەسـەری دەکـات ، پزیـشك و چارەسـازی دەرونـی و توێـژەری کۆمەڵایـەتی دەتوانن هاوکاری بکەن بە پێی پێویست.

٨- بـە ئاگـابوون لـەوەی نـەخۆش پـەنا نەباتـە بەربـەکارهێنانی مادەهۆشـبەرەکان و ئـەو دەرمانانـەی لەسـەری رادێـت و توشـی ئـالودەبونی دەکـات .گـەر پێویـستی کـرد بـەکاربهێنی دەبـێ بـۆ ماوەیـەکی دیـاری کـراو بـە برێکـی کـەم بێـت و رێگـە نـەدرێت نەخۆش ئەو دەرمانانە بکرێتەوە بەبێ پرسی پزیشك.

٩- دەرمانانـەکانی دژەخـەمۆکی بـە چارەسـەرێکی گرنگـی دڵـەراوکێ دادەنرێـت و نابێتە هۆی ئالوودەبوون .

١٠- هەنـدێ نیـشانەی دڵـەراوکی هەیـە( وەکـو دڵـەکوتی ، لـەرزین ) گـەر نـەخۆش بێزاربکـات دەتـوانین دەرمـانی پێویـستی بـۆ بـەکاربێنین بـەبێ ئـەوەی توشـی ئالوودەبونی بکات .

ئایندەی نەخۆش:

گـەر ماوەیـەکی کـورت بـێ زوربـەیان چـاك دەبنـەوە. گـەر مـاوەی شـەش مـانگ زیـاتر بێـت پێویـستی بـە چارەسـەر هەیـە بـە زیـاتر لـە رێگەیـەك ، یـەك لە پێنـچیان چـاك دەبنەوە و نەوانی تر پێویستیان بە چارەسەری درێژخایەن هەیە .

نەوانـەی مـاخۆلان ،بـیری خۆکوژی،نیـشانەکانی هـستریا، بورانـەوەیان هەیـە ئایندەیان زۆرباش نیە .

# حاڵەتی تۆقین

## Panic disorder

یەکێکە لە پەشێویە دەرونیەکان ،کە زۆرجار لای نەخۆش و پزیشکیش بە هەڵە دەستنیشان دەکرێت و بە نەخۆشیەکی جەستەیی دیاری دەکرێت. دەکرێت بە دوو جۆرەوە:

١- نۆبەی تۆقین: لەم بارەدا تاك توشی تۆقین دەبێت بەبێ هیچ پێشەکیەك و لە ماوەی ١٠ خولەکدا نیشانەکان دەگاتە لوتکەو نیشانەکان ماوەی ٢٠-٣٠ خولەك دەخایەنێ زۆر بە دەگمەن ماوەی کاژێرێکی پێدەچێت. رێژەی توشبوون نزیکەی لە ٨٪ دەبێت.

نیشانەکانی تۆقین:

- هەناسە تەنگی ،دڵەکوتێ، خێرا لێدانی دڵ، ئازاری سنگ .
- هەست بەخنکان، نزیك بوونەوە لە مردن تاك دەڵێت ﴿واهەست دەکەم خەریکە، دەمرم هەناسەم بۆ نادرێ، ئەڵێم ئێستا دڵم دەوەستێ﴾.
- دەم ووشکبوون ، عەرەقکردنەوە.
- لەرزین و راوەشاندن.
- هەستکردن بە گێژی و لاوازی و هەندێجار بوانەوە.
- هەستکردن بەوەی خۆی گۆڕاوە یان دەوروبەر گۆڕاوە .
- هەستکردن بەوەی خەریکە کۆنترۆڵی خۆی لەدەست بدات یان خەریکە عەقلی لە دەست بدات.
- سڕبوون .
- گەرم داهاتن یان هەستکردن بە ساردبونەوە.

٢- حاڵەتی تۆقین : بریتیە لە چەند نۆبەتێکی تۆقین ،تاك لە ترسی ئەوەدایە نۆبەتی تری بۆ بێت بۆیە ڕێرەوی ژیانی دەگۆڕێت و زیاتر لە ماڵدا گۆشەگیر دەبێت ، ئەمەش کاریگەری گەورەی دەبێت لەسەر ژیانی تاك ناتوانێت بەرەو بە رەوتی ژیانی بدات گەر خوێندکار بێت یان فەرمانبەر یان هەر کاروپیشەیەکی

تری هەبێت بەتایبەتی گەر بژێوی کەسانی تر لەسەر ئەم بێت ئەوا کاریگەری لەسەر ژیانی ئەوانیش دەبێت. دەشێ حاڵەتی تۆقین هاوشان بێت لەگەڵ حاڵەتی ئەگۆرەفۆبیا یان بە تەنها بێت.

هۆکاری ئەم حاڵەتە:

زۆری چالاکی نۆرئەدرینێرجیك و کەمی چالاکی گاما ئەمینۆبیوتاریك ئەسید و سوود وەرگرتنیان لەو دەرمانانەی کاریگەریان هەیە لەسەر ئاستی سیرۆتۆنین بەڵگەن لەسەر کاریگەری ئەم مادانە لە هۆکاری ئەم نەخۆشیە.

چارەسەر:

١- دەرمانی دژەخەمۆکی بەتایبەتی گرۆپی تایبەت بە رێگر لە گەڕاندنەوەی سیرۆتۆنین.

٢- دەرمانەکانی دژەدڵەراوکێ بۆ ماوەیەکی کورت و لەژێرچاودێری پزیشکدا.

٣- چارەسەری مەعریفی و ڕەوشتی.

# ترسی کۆمەڵایەتی

# Social phobia

بریتییە لە ترسێکی یان دڵەراوکێیەکی نەگونجاو تاك هەستی پێدەکات کاتێك بەرەو رووی بارێکی کۆمەڵایەتی دەبێتەوە کە لە لایەن کەسانی ترەوە چاودێری دەکرێ یان ڕەخنەی لێدەگیرێت.

بە پێی پەیمانگای نیشتمانی بۆ تەندروستی دەروونی لە ئەمەریکا نزیکەی ٣,٧٪ ی دانیشتوانی ئەمەریکا کە تەمەنیان لە نێوان ١٨-٥٤ ساڵە ترسی کۆمەڵایەتیان هەیە، نزیکەی ٥ ملیۆن هاولاتی دەکات. زۆربەی توێژینەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن لە مێینەدا زیاتر وەك لە نێرینە.

## هۆکاری ئەم حاڵەتە :

گەلێك هۆکاری کۆمەڵایەتی و دەروونی و بایۆلۆجی کارگەری هەیە لە سەرهەڵدانی ترسی کۆمەڵایەتی بۆ نمونە ئەو باوانەی کە زۆر بایەخ بە منداڵەکانیان دەدەن و بواری چالاکیان لێدەگرن لە هەموو کارێکی ژیانیاندا دەست وەردەدەن بواری هەناسە بۆ منداڵەکانیان ناهێڵنەوە ئەگەری توشبونی منداڵەکانیان بە ترسی کۆمەڵایەتی زیاترە لە منداڵانی تر.

بەسەرهاتی ناخۆشی ژیان لە سەرەتای تەمەندا کاریگەری ئاشکرای هەیە لە سەر ئایندەی تاك و سەرهەڵدانی ترسی کۆمەڵایەتی. هەروەها هۆکاری بۆماوە کاریگەری روونی هەیە سەرەرای ناهاوسەنگی لە ئاستی سیرۆتۆنین و دۆپامین و گاما ئەمینۆ بیوتاریك ئەسید. بۆماوە لە دووانەی دوو زەردێنە لە ١٥٪ و لە دووانەی یەك زەردێنەوە لە٢٥٪.

## نیشانەکانی :

دەشێ سنوردار بێ بۆ هەندێ باری کۆمەڵایەتی دیاری کراو یان گشتگیر بێ بۆ زۆربەی بارە کۆمەڵایەتییەکان وەکو ئەوەی ئاخاوتن لە نێو کۆمەڵێ خەڵکیدا ، لێدوان بۆ هۆکانی ڕاگەیاندن ، چاوپێکەوتنی خەڵکی نامۆ، بەخێرهاتنکردنی میوان، نانخواردن لە چێشتخانەی گشتیدا ، ترسان لە چوونە ناو دوکانەوە بە تەنها

بۆ كرينی پۆشاك و پێداويستی، قسەكردن لەگەڵ كەسانی بەرپرسدا، بۆ نمونە دەشێ خوێندكارێك زۆر زيرەك بێت بەلام لە پۆلدا بەشداری وەلامی پرسيارەكان نەكات چونكە ترسی ئەوەی هەيە هەڵە بكات لەو كاتەدا هەست دەكات هەناسەی تەنگ دەبێ و دڵی خێرا لێدەدات و دەمی ووشك دەبێ و گەلێ نيشانەی تر وای لێدەكات زيرەكی و بەهرەی خۆی دەرنەخات.

نيشانەكان سەرجەم كۆئەندامەكانی لەش دەگرێتەوە.

كۆئەندامی سوڕان: دڵەكوتێ، خێرا لێدانی دڵ، سنگ ئێشە.

كۆئەندامی هەناسە: نارەحەتی هەناسەدان ، هەستكردن بە خنكان.

كۆئەندامی هەرس: دەم ووشكبوون ، دڵتێكەڵهاتن، ژان و پێچ لە ريخۆڵەكان.

كۆئەندامی دەمار: مێرولەكردن و سربوونی دەمارەكان و لەرزين.

كۆئەندامی ميز: ميزەچوركێ، زووزووميزكردن.

سەرگێژبوون ، بەرچاوڕەشبوون، ترسی لەدەست دانی كۆنترۆل، ترسی مردن، گەرم داهاتن .

هەوڵ دەدات لەو شوێن و چالاكيانە خۆ بەدوور بگرێ و بيانويەك دەدۆزێتەوە بۆ بەشداری نەكردن.

**چارەسەر:**

١- چارەسەری سلوكی و مەعريفی.

٢- تەكنيكی چارەسەركردنی دڵەراوكێ.

٣- راهێنان لەسەر چالاكيە كۆمەلايەتيەكان.

٤- بەكارهێنانی دەرمان بۆ ماوەيەكی دياری كراو لە ژێر چاودێری پزيشكدا.

**ماكەكانی نەخۆشيەكە:**

ترسی كۆمەلايەتی گەر چارەسەرنەكرێ دەبێتە هۆی سنورداركردنی چالاكيەكانی ژيان وا لەتاك دەكات توشی هەندێ نارەحەتی و گرفت ببێ گرنگترينيان ئەمانەن:

١- بەكارهێنانی مەی و مادەهۆشبەرەكان بۆ زالبوون بەسەر حالەتەكەدا بەلام سات بە سات خراپتر دەبێ و گيرۆدەی زيانەكانی ئەم مادانەش دەبێ.

٢- بە زەحمەت دەتوانێت هاورێ پەیدا بکات.

٣- سنورداری خوێندن یان کارکردن ، هەرگیز توانای ڕاستەقینەی خۆی بەدەرناکەوێ بۆیە لە بواری خوێندن و کاردا مافی خۆی وەرناگرێ.

٤- بیری خۆکوژی نزیکەی ٣٤٪ بیری خۆکوژیان هەیە ولە ١٢٪ یان هەوڵی خۆکوژیان هەیە.

٥- زۆرجار ترسی کۆمەڵایەتی هاوشان دەبێت لەگەڵ نەخۆشیە دەرونیەکانی تردا بۆ نمونە ٢٠٪ -٣٥٪ یان خەمۆکیان هەیە و نزیکەی ١٣٪ حاڵەتی تۆقینیان هەیە و نزیکەی نیوەیان ترسی تایبەتیان هەیە و لە ٣٤٪ یان حاڵەتی واسواسیان هەیە . بە شێوەیەکی گشتی نزیکەی لە ٨٠٪ یان جگە لە ترسی کۆمەڵایەتی حاڵەتێکی دەرونی تریان هەیە.

زۆرگرنگە ترسی کۆمەڵایەتی لە شەرم کردن جیابکەینەوە ئەویش بەوەی شەرم کردن کاتێك ڕوودەدات کە پەیوەندی بکەیت بە خەڵکیەوە بەڵام ترس لەو کاتەو تەنانەت لە کاتی چاوەڕوانی بۆ پەیوەندی کردنیشدا ڕوودەدات، شەرم هۆکارەکەی دەرونیە بەڵام ترس هۆکارەکەی دەرونی وکیمیاویشە، چارەسەری شەرم بە ڕێنمایی دەرونی دەبێت بەڵام ترس بە ڕێنمایی و دەرمان ،لە حاڵەتی شەرمدا تۆقین روونادات بەڵام لە ترسدا ڕەنگە رووبدات.

ئایندەی نەخۆش:

بە بەکارهێنانی دەرمان و چارەسەری دەرونی لە ٩٠٪یان چاکدەبنەوە.

حاڵەتێك: کوڕێکی تەمەن ٢٨ ساڵ، دانیشتووی شار، خوێندنی ناوەندی تەواوکردووە، لە یەکێك لە فەرمانگەکانی میریدا کاردەکات، لەرووی کۆمەڵایەتیەوە دابڕانێکی ئاشکرای هەیە ، تەنانەت لە ئاهەنگی ژنهێنانی براکەی بەشداری نەکردووە، هەر لەبەر ترس لە تێکەڵ بوون نەچۆتە زانکۆ یان پەیمانگا، گرفتی سەرەکی نەتوانینی هاوسەرگیریە چونکە هەست بە ترسێکی گەورە دەکات لەوەی لەگەڵ میێدا گفتوگۆ بکات.بە تەنیا ناچێتە هیچ چێشتخانەیەك لە ترسی چاوی خەڵکی. پاش چوار مانگ لە ڕێنمایی دەرونی و چارەسەر بە دەرمان ماوەیەك پێش ئێستا چۆتە ژیانی هاوسەریەوە.

## ترسی تایبەت ( دیاریکراو ) یان ترسی سادە

## Specific phobia (Simple phobia)

بریتیە لە ترسانێکی بێ پاساو لە شتێکی یان دیاردەیەکی دیاریکراو .ڕێژەی توشبوون نزیکەی لە ١١٪ ، نێر زیاتر توشدەبێت وەك لە مێ بەلام ترس لە گیانداران لە مێدا زیاترە.

**هۆکاری ئەم حالەتە :**

١- بە پێی تیۆری شیکارە دەرونی هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ترسێکی دیاریکراو لە نەستدا بە پێی کات خۆی دەنوێنێ لە هەستدا بە ترسان لە شتێکی تر.

٢- بە پێی تیۆری فێرکاری هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ فێرکردن لە قۆناغەکانی سەرەتای تەمەندا منداڵ فێردەکرێ لە دیاردە و شتەکانی دەوروبەر بترسێ.

٣- بۆ ماوە لە دوانەی یەك زەردێنە لە ٢٥٪ لە دوانەی دوو زەردینە لە ١١٪.

**جۆرەکانی :**

١- ترس لە گیانداران : مشك ، مار، سیسرك، کولە، ........هتد لە قۆناغی منداڵیەوە سەرهەڵدەدات.

٢- ترس لە دیاردە سروشتیەکان: هەورە بروسکە، باران، لافاو، زریان،......هتد بەهەمان شێوە لە منداڵیەوە سەرهەڵدەدات.

٣- ترس لە شوێنی دیاری کراو: بەرزکەرەوە( مصعد )، پرد، شوێنی داخراو،.....هتد.

٤- ترس لە خوێن – دەرزی لێدان: ترس لە بینینی خوێن یان برینداری یان دەرزی لێدان زۆرجار لەگەلیدا دەبورێتەوە.

٥- جۆرەکانی تر: وەکو ترس لە نەخۆشی یان ترس لەوەی شتێك نەبێ پالی پێوە بدات.

**چارەسەر:**

ترسی تایبەت هەمیشە لەڕێی چارەسەری کرداریەوە ( سلوکی )ەوە چارەسەر دەکرێت ، ئەویش بە :

١- کەم کردنەوەی هەستەوەری بەوەی هێدی هێدی لەو شتەی نزیک بکەیتەوە کە لێی دەترسێ بۆ نمونە گەر لە بەرزی دەترسێت هێدی هێدی و هەرجارەی نهۆمێك بەرزتر دەروات بە هاوکاری یەکێك ، یان گەر لە گیاندارێك دەترسێ بەهەمان شێوە ووردە ووردە لەو گیاندارە نزیك دەکرێتەوە.

٢- نوقمکردن: واتە ڕاستەوخۆ و بەبێ پێشەکی بەرەو ڕووی حاڵەتەکە دەکرێتەوە بۆ نمونە گەر لە مشك دەترسێ دەخرێتە ژوورێکەوە کە چەند مشکێکی تێدا بێت، یان گەر لە بەرزی دەترسێ دەبرێتە سەربانی باڵەخانەیەکی چەند نهۆمی.

٣- ڕۆل بینین: هەوڵ دەدرێت لەرێی نواندنەوە وای لێبکرێت ترسەکەی کەم بێتەوە.

# ئەگۆرەفۆبیا

# Agoraphobia

مەبەست لێی ترسانە لە شوێنی کراوە بەڵام بۆ ترس لەم شوێنانەش بەکاردێ

- بازاڕو سوپەرمارکێت.
- پاس و شەمەندەفەر.
- قەرەباڵغی.

هەر شوێنێك کە نەتوانرێت بەجێ بهێڵرێ بەبێ ئەوەی ببێتە جێی سەرنج ڕاکێشانی (هۆشپێدانی) دەوروبەر وەکو کورسی ناوەڕاستی شانۆ. ڕێژەی توشبوون نزیکەی لە ۲٪ دەبێت، مێ سێ هێندەی نێر توشی دەبێت.

گەر چارەسەر نەکرێ ڕۆژ بەڕۆژ خراپتر دەبێ تاوای لێدێت زوربەی کات لەماڵدا دەبێ و زۆر بەکەمی دەچێتە بازاڕ و ژیانی ئاسایی نامێنێت. لە هەندێ حاڵەتی قورسدا لە ماڵ ناچێتە دەرێ گۆشەگیر دەبێ چاوەڕێیە کەی نۆبەکەی بۆ بێت.

ئەگۆرەفۆبیا دەشی هاوشان بێت لەگەڵ نۆبەی تۆقین یان بەبێ تۆقین بێت. بە هەمان شێوەی حاڵەتی تۆقین چارەسەر دەکرێت دەتوانین هاوسەرەکەی یان یەکێك لە ئەندامانی خێزان وەکو یاریدەدەری چارەساز بەکاربێنین.

## واسواسی ( عەمەلی )

## Obsessive compulsive disorder

بریتیە یە سەرهەڵدانی حاڵەتێکی دەرونی کە هەمان بیر ، بۆ چوون ، وێنە ، چەند بارە دەبێتەوە لە مێشمی تاکدا و دڵنیایە لەوەی لە ناخی خۆیدا سەرهەڵدەدات نەك لە دەرەوە بەسەریدا بسە پێنرێ و هەوڵی بەرەنگاربونەوەی دەدات بەلام زۆرجار بێهودەیە و ناچاردەبێت شوێنی ئەو بیرو بۆچوونانە بکەوێت و کاتێکی زۆری خۆی بەو بابەتانەوە دەکوژێت . گەر شوێن ئەو بیرانە نەکەوێت هەست بە نارەحەتی دەکات و وازی لێناهێنن دووبارەو چەندبارە دەبێتەوە و گەر شوێن ئەو بیرانە بکەوێت برێك بۆ ماوەیەکی کاتی هەست بە ئارامی دەکات بەلام کاتێکی زۆری لێدەگرێت و بەردەوام بابەتی بێماناتر و سەیرتر بە مێشکیدا دێت.

بۆ نمونە، تاك بەردەوام بە بیریدادێت کە قسەی ناشرین یان رەفتارێکی نەشیاو یان کوفر بکات بەبێ هیچ هۆیەکی دیار، یان بەبیریدا دێت زیان بە دەوروبەر بگەیەنێ یا دووبارەکردنەوەی ژماردنی ژمارەکان بەشێوەیەکی دیاری کراو ، هەندێجار ئەم بارە لە سنوری بیرکردنەوە تێپەردەبێت و دەچێتە بواری کردارەوە وەکو دووبارە وچەند بارە دەست شتن هەندێ جار تاك ماوەی چەند کاژێرێ بەم کارەوە خەریك دەبێ، سەرەرای ئەوەی دەزانێ دەستی پاکە یان ئەم کارەی زیادەرۆیی تێدایە. چەند بارەکردنەوەی قامەت بەستن لە نوێژدا ، شەوان چەند جارێ دەست دەدات لە دەرگای ژوورەکە بۆ دڵنیا بوون لە داخستنی سەرەرای ئەوەی دەزانێ کە دەرگاکە داخراوە. رێك خستنی کەل وپەلەکانی بەشێوەیەکی زۆر وورد و بەدیقەت کە تەنها لای تاکی واسواس مانای هەیە و لای کەسانی دەوروبەری بە ناتاسایی ناو دەبرێت .

هەندێجار پەیوەندی نێوان ئەو بیرانەو ئەو رەفتارەی دەیکات بە روونی دیارە وەکو ئەوەی گومانی ئەوەی هەیە شتەکان پیسن بۆیە بەردەوام دەستی دەشوات یان دەست نادات لە شتەکانەوە تاکو پیس نەبێت ، یان گومانی لە باوەری خۆی هەیە بۆیە چەندەها جار شایەتمان دووبارە دەکاتەوە و قورئان دەخوێنێ و بەردەوام نوێژ

دەکــات تــاکو ئیمــانی ســەلامەت بــێ ، لــە هەنــدێ حاڵــەتی تــردا ئــەم پەیوەندیــە روون نیــە وەکــو ئــەوەی تــاك هەڵدەســتێ بەلەبــەرکردنی پۆشــاکەکانی بەشــێوەیەکی دیــاری کــراو و دەبــێ چــەند ڕەفتارێــك بکــات پــێش لەبــەرکردنی پۆشــاکەکەی کــە هــیچ پەیوەندیەك نیە لەنێوان ئەو ڕەفتارانە و خۆگۆرین.

ئــەم حاڵەتــە نزیکــەی لــە٠,٥ ٪ - ٢٪ ی خــەڵکی توشــی دەبــن و ڕێــژەی توشــبونی نێــرو مــێ تارادەیــەك یەکــسانە .لــە ٧٠٪ی حاڵەتــەکان پــێش تەمــەنی ٢٥ ســاڵی ڕوودەدەن و لە ١٥٪ یان دوای تەمەنی ٣٥ ساڵی.

## هۆکاری ئەم حاڵەتە :

١- بۆمــاوە: بــەلام نــەك بــەو مانایــەی گــەر بــاوان ئــەم حاڵەتــەیان هــەبوو منداڵــەکانیان تــوش دەبــن بــەڵکو لــەو تێروانینــەوە کــە ئەگــەری توشــبوون زیــاد دەکــات بــۆ ٣٪-٧٪. دوانــەی یــەك زمردێنــە ٥٠٪ - ٨٠٪ و دووانــەی دوو زمردێنــە لــە ٢٥٪.

٢- پــەروەردەکرن: پــەروەدەکردنی منــداڵ لــە سەرشــێوازێکی تایبــەت بــە تایبــەتی لــە لایەن دایکی واسواسەوە وادەکات ئەگەری توشبوون زیاتر بێت.

٣- دابــەزینی ئاســتی ســیرۆتۆنین لــە مێــشکدا دەبێتــە هــۆی ســەرهەڵدانی ئــەم حاڵەتــە بۆیــە لــە چارەســەردا پــشت بــەو مژادانــە دەبەســترێ کــە ئاســتی ئــەم مادەیــە لــە مێشکدا زیاد دەکەن.

زۆر گرنگــە بــۆ پزیــشك کــە ئــەم حاڵەتــە لــە تەنگــژەی دڵــەراوکێی گــشتی و خــەمۆکی و سکیزۆفرینیا جیابکاتەوە سەرەڕای دڵنیابوون لە نەبوونی نەخۆشی جەستەیی .

## چارەسەر:

١- هەوڵــدان بــۆ چارەســەرکردنی هــەر نەخۆشــیەك کــە هاوشــان بێــت لەگەڵیــدا وەکــو خەمۆکی.

٢- روونکردنــەوەی هۆکــار و نیــشانەکانی نەخۆشــیەکە بــۆ تــاك وخێزانەکــەی کــە ئــەم حاڵەتە جێی ترس نیە و چارەسەر دەبێت.

٣- بــەکارهێنانی دەرمــانی دژە دڵــەراوکێ بــۆ ماوەیــەکی کــورت گــەر پێویــستی کــرد.لــەژێر فــشاری نــەخۆش یــان کەســوکــاری نــەخۆش بــۆ مــاوەی زیــاتر لە پێویــست بەکار نەهێنرێ چونکە دەبێتە هۆی ئالودەبوون.

٤- پــەیرەوی کردنــی ڕاهێنانــەکانی خــۆ خاوکردنــەوە و تێفروسمانــدن بــە خــود تــاکو

زاڵبیت بەسەر ئەو بیرانەدا.

٥- پەیڕەوی کردنی ڕێنماییەکانی چارەسازی دەروونی و پزیشکی دەرونی کە دەدرێت بە تاك لەکاتی دانیشتنەکانی چارەسەری دەرونیدا.

٦- بەکارهێنانی دەرمانەکان بە بڕی پێویست و بۆ ماوەی دیاریکراو کە لە لایەن پزیشکەوە دیاری دەکرێت بەکاربهێنرێت ، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ١٦ – ٢٤ هەفتەیە گەر پێویستی کرد بۆ ماوەیەکی درێژتریش بەکاردەهێنرێت چونکە نابێتە هۆی ئالوودەبوون.

٧- گرنگترین دەرمان کە بەکاردەهێنرێت دەرمانەکانی دژەخەمۆکی بە تایبەتی ئەو گروپەیان کە تایبە تمەندە بە کەمکردنەوەی گەڕاندنەوەی مادەی سیرۆتۆنین بۆ دەمارەخانەکان بەمەش ئاستی سیرۆتۆنین بەرزدەبێتەوە. نمونەی ئەم گروپەش وەك فلوکستین و سێرترالین و پارۆکستین و سیتالۆپرام..... هتد.

## ئایندەی تاك:

دوو لەسێی حاڵەتەکان لە ماوەی کەمتر لە ساڵێدا چاك دەبنەوە بە بەکارهێنانی دەرمانی پێویست و ئەوانی تر ( یەك لە سێ) حاڵەتەکایان چاك دەبێ بەلام ناوبەناو نیشانەکانیان سەرهەڵدەداتەوە و پێویستیان بە ڕێنمایی و چارەسەری درێژ خایەن دەبێت.

لە ٢٠٪-٣٠٪ بە تەواوی چاك دەبنەوە.

٤٠٪-٥٠٪ چاکبونەوەیەکی مامناوەند.

٢٠٪-٤٠٪ دەبێتە حاڵەتێکی درێژخایەن.

## ئەو هۆکارانەی ئایندەی تاك خراپ دەکەن:

١- بوونی واسواسی کرداری.

٢- لە تەمەنێکی کەمەوە لە منداڵیەوە یان لە سەرەتایی هەرزەکاریەوە دەست پێبکات.

٣- ماوەیەکی زۆر بخایەنێت.

٤- هاوشان بێت لەگەڵ خەمۆکی.

٥- واسواسیە کرداریەکەی بازاڕی بێت واتە پەیوەندی نەبێت بە جۆری واسواسیە فکریەکەوە.

٦- بونی وەهم یان بەرزنرخاندنی ئایدیا.

٧- پەشێوی کەسێتی وەکو کەسێتی واسواسی یان سکیزۆتایپەڵ.

## پەیامەکان بۆ تاك و خێزان:

١- بە هیچ جۆرێك پێویست ناکات بۆ چارەسەری ئەم حاڵەتە سەردانی کەسانی ناشارەزا بکرێت کە ناوی خۆیان ناوە مەلا و شێخ چونکە ئەمە کاری ئەوان نیە و زۆربەی جار لەبری چاك کردنەوە حاڵەتەکە خراپتری دەکەن بە هۆی ئەو شێوازە نا مرۆڤانەیەی بەکاری دێنن لە چارەسەردا کە نە ئاینی پیرۆزی ئیسلام و نەزانستی پزیشکی و نەیاسای وولات رێگەی بەم کارەیان داوە.

٢- ئەم حاڵەتە نەنگی نیە و نابێتە هۆی لە دەستدانی هۆشمەندی.

٣- ئەم حاڵەتە چارەسەری هەیە و دەتوانرێت لەرێی دەرمان و جەلسەی دەرونیەوە چارەسەر بکرێت.

٤- تاکو زووتر سەردانی پزیشك بکەیت ئەگەری چاکبونت زۆرتر و باشترە.

٥- گەر تاکێکی خێزانەکەت ئەم بارەی هەبوو دەبێت خۆت بەدوور بگری لە توانج لێدان و قسەی ناشرین چونکە بەم کارەت بارەکە خراپتر دەکەیت نەك باشتر، بەم کارەت وا دەکەیت ئەو کەسە زیاتر نارەحەت بێت.

٦- هەوڵ مەدە فشار بخەیتە سەر تاك بۆ زوو چاك بونەوە چونکە ئەوەی ئەو هەستی پێدەکات تۆ ناتوانی بە ئاسانی لێی تێبگەیت هەوڵ بدە هاورێی بیت نەك فشارێکی زیاتر.

# پەشێوی پاش زەبری دەرونی

## Post traumatic stress disorder

**هەموو برینێك بینراو نیە :**

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین پێناسەی ئەم حاڵەتە بکەین بەوەی یەکێکە لە حاڵەتەکانی دڵەراوکێ ، بریتیە لە شڵەژانێکی دەروونی یان سۆزداری تەشەنە دەکات پاش توشبوونی کەسێك بە رووداوێکی زەبراوی توند کە لە میانەیدا هەست بە ترسێکی زۆر دەکات یان رووداوێکی هاوشێوە دەبینێ کە توشی یەکێکی تر دەبێت.

**رێژەی توشبوون :**

لە مێدا لە ١٠٪- ١٢٪ دەبێت و لەنێردا ٥٪ -٦٪ دەبێت . هەموو تەمەنێ ئەگەرێ توشبوونی هەیە بەتایبەتی لە لاوێتیدا.

## نیشانەکانی :

١- دوبارە بونەوەی وێنەی رووداوەکە.

- گەراندنەوەی بەردەوامی روداوەکە لە شێوەی شالاودا بۆ سەر بیر ( بیری هێرشبەر) و خەیاڵ کە دەبێتە هۆی گرژی و خەمباری .
- دووبارە بوونەوەی خەوی ناخۆشی پەیوەندار بە روداوەکەوە.
- وا رەفتارکردن یان هەستکردن بەوەی رووداوەکە دووبارە دەبێتەوە.( هەستکردن بەوەی لە روداوەکەدا دەژی یان بونی هەلوسە یان بە هەڵە راڤەکردنی شتەکانی دەوروبەر بەو ئاقارەی کە روداوەکە رودەداتەوە.
- گرژی دەرونی کاتێك بەرەو رووی شتێك دەبێتەوە ئەو روداوەی بیر دەخاتەوە.
- گۆرانکاری فسیۆلۆجی کاتێك بەرو رووی شتێك یان ئاماژەیەکی دەرەکی یان ناوەکی دەبێتەوە کە روداوەکەی دێنێتەوە یاد.

٢- خۆبەدوورگرتن یان خۆلادان: سیان یان زیاتر لەمانەی خوارەوە

- هەوڵدان بۆ خۆ بەدوورگرتن لەو فکر و هەست و کفتوگۆیانەی پەیوەندیان بە روداوەکەوە هەیە.
- هەوڵدان بۆ خۆبەدوور گرتن لەو چالاکی وشوێن و کەسانەی رووداوەکەی

دێننەوە یاد.

- نەتوانینی وەبیرهێنانەوەی بە شێکی گرنگی ڕووداوەکە.
- کەمبونــــەوەی ئــــارەزوو و توانـــای بەشـــداری کـــردن لـــە چـــالاکیەکاندا بەشـــیوەیەکی بەرچاو.
- هەستکردن بە نامۆی و دابڕان لە خەڵکی.
- تەسکبونەوەی لایەنی سۆزداری﴿ ناتوانێت هەست بە خۆشەویستی بکات﴾.
- هەســـتکردن بـــە تەســـکبونەوەی خەونـــەکانی دوارۆژ ( بـــێ بـــاوەڕی بەرامبـــەر بـــەوەی بتوانێت ژیانی هاوسەری پێکبێنێ ، منداڵی ببێت، تەمەنی ئاسایی هەبێت ).

٣- نیشانەکانی بە ئاگایی : لایەنی کەم دوانی لەمانەی خوارەوە هەبێت

- بە زەحمەت خەو لێکەوتن یان بەردەوام بوون لە نوستن.
- گرژی و نۆبەی هەڵچوون.
- گرفتی هۆشپێدان.
- زیادەڕۆیی لە بەئاگابوون.
- زیادەڕۆیی لە وەڵامدانەوەی جەستەیی.

ســـەرەرای ئەمانـــە دەشـــێ تـــاك هەنـــدێ نیـــشانەی تـــری هـــەبێت وەك شـــەرمكردن و کەمبونـــەوەی چـــالاکی کۆمەڵایـــەتی و هەنـــدێ ڕەفتـــاری نادروســـت بـــۆ زاڵبـــوون بەســـەر حاڵەتەکـــەدا وەك پەنابردنـــە بـــەر جگەرەکێـــشان و خواردنـــەوە، گرفـــت لـــە هۆشـــپێدان و بیرکردنەوەدا ،هەســـتکردن بـــە ئـــازار لـــە زوربـــەی بەشـــەکانی لەشـــدا بەتاییـــەتی گـــەر شـــوێنێکی لـــە روداوەکـــەدا زیـــانی پێگەشـــتبێت ،دەشـــێ نیـــشانەکان هاوشـــان بـــن لەگـــەڵ هەندێ پەشێوی دەرونی تردا وەکو دڵەراوکێ ، خەمۆکی، ترس ، تۆقین....

بـــۆ ئـــەوەی یـــەکێك دەستنیـــشان بکـــەین بـــەوەی حاڵـــەتی تەنگـــژەی پـــاش زەبـــری دەرونـــی هەیـــە دەبێـــت نیـــشانەکانی کۆمەڵـــەی ﴿ ١ + ٢ + ٣ ﴾ لایـــەنی کـــەم مانگێـــك بخایـــەنێت و کاربکاتـــە ســـەر توانـــای کـــارکردن و پەیوەنـــدی کۆمەڵایـــەتی بـــە شـــێوەیەکی ئاشکرا.

هەنـــدێجار ئـــەو ڕووداوە دەبێتـــە ســـەرەتای ســـەرهەڵدانی حاڵـــەتێکی دەرونـــی بەتاییـــەتی گـــەر تـــاك ئامادەباشـــی تێـــدا بێـــت بـــۆ ئـــەو حاڵەتـــە و هەنـــدێ توێژینـــەوە

ئامـــاژه بـــەوه دەدەن لـــە مـــاوەی شـــەش مـــانگی دوای رووداوێکـــی ترســـناك یـــان نـــاخۆش ئەگەری خەمۆکی بە شەش هێندە و سکیزۆفرینیا بە سێ هێندە زیاددەکات.

جۆرەکان :

١- کورتخایەن : گەر نیشانەکان کەمتر لە سێ مانگی خایاند.

٢- درێژخایەن : گەر نیشانەکان زیاتر لە سێ مانگی خایاند.

٣- دواکەوتوو: گەر سەرهەڵدانی نیشانەکان پاش شەش مانگ یان زیاتر بێت.

کێن ئەوانەی ئەگەری توشبونیان هەیە؟

١- هەر کەسێك توندوتیژی بەرامبەر بکرێت.

٢- قوربانیانی توندوتیژی خێزانی.

٣- ئەوانەی دەستدرێژی سێکسیان دەکرێتە سەر.

٤- ئەوانـــەی توشـــی فڕانـــدن دەبـــن بـــەرەورووی دەســـت درێـــژی جەســـتەی یـــان ســـێکی دەبنەوە.

٥- قوربانیانی روداوی رێوبان ، تەقینەوە، ئاگرکەوتنەوە،کرداری تیرۆرستی.

٦- قوربانیـــانی رووداوە سروســـتیەکان وەکـــو بومەلـــەرزە(زەمـــین لـــەرزە)، لافـــاو ، بورکان.

٧- ئەو سەربازانەی لە جەنگدا بەشداری دەکەن .

٨- ئەوانـــەی دەستنیـــشان دەکـــرێن بـــەوەی نەخۆشـــیەکی مەترســـیداریان هەیـــە یـــان پێویستیان بە نەشتەرگەریەکی گەورە هەیە.

٩- لەدەستدانی کەسوکار بەتایبەتی کەسوکاری پلەیەك.

١٠- لەدەستدانی ماڵ ودارایی و پیشە.

مـــەرج نیـــە هـــەر کەسـێك یـــەکێك یـــان زیـــاتر لـــەم رووداوانـــەی بەســـەردا هـــات یـــان بـــینی دووچـــاری تەنگـــژەی پـــاش زەبـــری دەرونـــی ببێـــت ، وەك ووتمـــان مێینـــە نزیکـــەی لـــە ١٠٪ و نێرینـــەش نزیکـــەی لـــە ٥٪ واتـــە مـــێ دووهێنـــدەی نێـــر ئەگەرتوشـــبوونی هەیـــە بـــەڵام هەندێ هۆکارهەن وادەکەن تاك ئەگەری توشبوونی زیاتر بێت لەوانە :

١- رووداوەکە زۆرتوندو بەهێزبێت.

٢- رووداوەکە ماوەیەکی زۆر بخایەنێت.

٣- پێشتر تەنگژە یان پەشێوی دەونی هەبوبێت.

٤- نەبوونی پاڵپشتی خێزانی یان هاورێی نزیك كە هاوكاری بكات.

٥- ئەندامێكی تری خێزانەكە حاڵەتی پەشێوی پاش زەبری دەرونی هەبێت.

٦- ئەندامێكی تری خێزانەكە حاڵەتی خەمۆكی هەبێت.

**هەنـــدێ هۆكـــاری تـــر هـــەن وا دەكـــەن حاڵەتەكـــە خـــرا پتر بێـــت گرنگترینیان:**

- گەر رووداوەكە كوتوپڕ وچاوەروان نەكراوبێت.
- گەر رووداوەكە بۆ ماوەیەكی درێژ بەردەوام بێت.
- كەوتنە ناو روداوەكە وەكو گەمارۆیەك بێت و نەتوانێت لێی رزگاربێت.
- دەستكردی مرۆڤ بێت و هەڕەشە بێت لەسەر ژیان و تەندروستی.
- قوربانی زۆری لێبكەوێتەوەو لە نێوانیاندا منداڵیشی تێدابێت.
- ببێتـــە هـــۆی شـێواوی جەســـتە و كەمئەنـــدام بـــوون وەك لـــە دەســـتدانی دەســـت ، قـــاچ ، چاو....

ئایا كامیان كاریگەری زیاترە ئەو روداوانەی دەستكردی مرۆڤن یان سروشتی؟

بـــەلێ وەك ووتمـــان روداوەكـــان دوو جـــۆرن كاریگـــەری ئـــەو روداوانـــەی دەســـتكردی مـــرۆڤن زۆر زیـــاترە لـــە رووداوە سروشـــتیەكان بـــەهۆی ئـــەوەی روداوە سروشـــتیەكان تـــاك بـــەوە ســـەبوری و ئـــارامی خـــۆی دەداتـــەوە كـــە دەســـتەلاتی نیـــە و كـــاری خواوەنـــدە و بەرامبـــەر كـــاری خـــوا هیـــچی پێنـــاكرێ و كـــەمتر هەســـت بـــە شـــەرمەزاری دەكـــات و كـــەمتر لۆمـــە دەكـــرێ لـــە لایـــەن كەســـانی تـــرەوە ئەمـــە وای لێـــدەكات پاڵپـــشتی زیـــاتر بێـــت و كەســـانێكی زۆر دڵنەوایی بكەن.

بـــەلام روداوەكـــانی دەســـتی مـــرۆڤ بـــە هێنـــدەی ئەوانـــەی دڵنـــەوایی دەكـــەن هـــەمان ژمـــارە یـــان زیـــاتر لۆمـــەی دەكـــەن ئـــەی نەتـــدەتوانی وابكـــەی ؟ گـــەر وات نەكردایـــە ؟ ئـــەی نـــەت تـــوانی فلانـــە شـــت بكـــەی ؟ ئـــەم رســـتانە لـــەبری ئـــەوەی برینـــی ســـارێژ بكـــەین زامـــەكانی قـــوڵتر دەكـــەن و توشـــی برینـــی دووەمـــی دەكـــەن كـــە كاریگـــەری دەرونـــی لـــە برینـــەكانی روداوەكـــە كـــەمتر نیـــە. ســـەرەڕای بـــیری تۆڵـــە ســـەندنەوە كـــە كـــاتێكی بـــاش

دەگرێت وا لەتاك دەكات ئێستای بە روونی نەبینێت و بڕیارەكانی دروست نەبێ.

كامیان كاریگەرترە یەك رووداو یان چەند رووداوێك؟

ئەوەی ئاشكرایە یەك رووداوە دەشێ ببێتە هۆی پەشێوی پاش زەبری دەروونی بەڵام چەند رووداوێك دەبێتە پەشێوی ئاڵۆزی پاش زەبری دەروونی ، زۆربەی حاڵەتەكانی پەشێوی پاش زەبری دەروونی لەماوەی كەمتر لە شەش مانگدا چاكدەبنەوە بەڵام ئەوانەی توشی پەشێوی ئاڵۆزی پاش زەبری دەروونی دەبن ماوەی چەند ساڵێكیان دەوێ بۆ چاكبونەوە.

ڕێژەی ئەوانەی توشی پەشێوی پاش زەبر دەبن بە پێی جۆری رووداوەكە:

بێگومان قوربانیانی رووداوە جیاجیاكان بە هەمان ڕێژە توشی پەشێوی پاش زەبری دەروونی نابن ئەمەی خوارەوە هەندێ ڕێژەیە :

١- لە سەدا دووی قوربانیانی هەر رووداوێك.
٢- لە ٣٠٪ قوربانیانی جەنگی ڤێتنام.
٣- لە ٦٥٪ قوربانیانی دەستدرێژی گەر سێكسی نەبێت.
٤- لە ٨٤٪ ئەو ژنانەی لە شێڵتەرەكاندا توشی توندوتیژی دەبن.
٥- لە ٦٠٪ ئەوانەی دەفرێنرێن.

## چارەسەر:

جەلسەی دەروونی: بەیەكێك لەرێگە چارە گرنگەكان دادەنرێت بە پەیرەو كردنی رێنماییەكانی چارەسازی دەروونی برێكی بەرچاو لەنەخۆشەكان سوودمەند دەبن.

١- بەكارهێنانی دەرمان: بەتایبەتی ئەو دەرمانانەی كاریگەریان لەسەر مادەی سیرۆتۆنین هەیە . هەروەها بۆ ماوەیەكی كورت دەتوانین دەرمانەكانی دژەدڵەراوكێ بەكاربێنین و لەهەندێ حاڵەتدا پێویستمان بە حەبی پرۆپرانۆلۆل ، دژەسایكۆسس دەبێ. بێگومان بڕ و جۆری دەرمان و ماوەی بەكارهێنانی لە لایەن پزیشكەوە دیاری دەكرێت.

ماكەكانی:

گەر چارەسەر نەكرێ دەشێ تاك توشی خەمۆكی ، خراپ بەكارهێنانی دەرمان و مادەهۆشبەكان، بیری خۆكوژی و ئەگەری خۆكوشتن ببێ.

**ئایندەی تاك:**

چــاكبونەوە ئایندەیــەكی گــشتیە نــەك تــاك وتــەرا . زوربــەیان بــە تــەواوی چــاكدەبنەوەو دەشــێ برێكــی كــەمیان حاڵەتەكــەیان ببێتــە درێژخایــەن و پێویــستیان بــە چارەسەرو چاودێری درێژخایەن ببێت.

# تێکچونی کەسێتی

## Personality disorders

زۆرکات گوێ بیستی ئەوە دەبین کەسێك کەسێتی بەهێزە و یەکێکی تر لاوازە، کەسێك زۆر عاتفیە و یەکێکی تر دڵڕەق، یەکێك زۆر کراوەیە و یەکێکی تر زۆر ووشك، ئەمانەو گەلێ تایبە تمەندی تر کە لە کەسێتی تاکدا هەیە.

تێبینی :

١- باسکردن لەم بابەتە مانای ئەوە نیە هەرکەسێکمان دی برێك لەم نیشانانەی هەبوو واتە تێکچونی کەسێتی هەیە.

٢- مەرج نیە تاك هەموو تایبە تمەندیەکانی جۆرێکی هەبێت دەشێ نیشانەی دووجۆر کەسێتی یان زیاتری هەبێت بەبێ ئەوەی پێناسەی تێکچونی کەسێتی بەسەردا بسەپێت.

٣- مەرجە تێکچونی کەسێتی پێش تەمەنی ١٨ساڵی دەست پێبکات و تاك لە کاتی دەست نیشانکردندا دەبێ تەمەنی لە ١٨ زیاتر بێت.

٤- بۆ دەست نیشانکردنی هەر جۆرێك دەبێ تاك کۆمەڵێك نیشانەی هەبێت لەم باسەدا بە گونجاوم نەزانی دیاری بکەم.

٥- بە شێوەیەکی گشتی نزیکەی لە ١٠٪ ی خەڵکی جۆرێك لەم کەسێتیانەیان هەیە، واتە لە٩٠ ٪ ی هاولاتیان ئاسایین و هیچ کام لەم کەسێتیانەیان نیە.

٦- لەرێی زانینی کەسێتیەوە دەتوانیت هاوسەری گونجاو بۆ خۆت هەڵبژێریت چونکە هەندێ جۆر کەسێتی هەیە هەرگیز پێکەوە نایانکرێت بۆیە دەتوانیت خۆت بەدوور بگریت لێیان بۆ ئەوەی ژیانی خۆت و ئەویش نەکەیتە دۆزەخ.

٧- لە رێی زانینی کەسێتی تاکەوە دەتوانین جۆری پیشەی گونجاوی بۆ دیاری بکەین چونکە هەندێ کەسێتی لە هەندێ کاردا سەرکەوتووە و لە هەندێ کاری تردا ناتوانێت بەرێوەی بەرێت.

٨- ژیان لەگەڵ ئەوانەی تێکچونی کەسێتیان هەیە کارێکی ئاسان نیە لەهەمان کاتدا مەحال نیە گەر بتوانن چارەسەری پێویستی بۆ بکەین و برێك لێزانانە

لەگەڵیدا هەڵسوکەوت بکەین.

## پۆلێنکردنی تێکچونی کەسێتی

**تێکچونی کەسێتی پۆلێن دەکرێت بۆ سێ گروپی سەرەکی :**

١- کۆمەڵەی گوماناوی:

- تێکچونی کەسێتی گوماناوی.
- تێکچونی کەسێتی شیزی.
- تێکچونی کەسێتی شیزی بچوك.

٢- کومەڵەی سۆزداری یان هەڵەشەیی:

- تێکچونی کەسێتی دژەکۆمەڵ.
- تێکچونی کەسێتی ناجێگیری .
- تێکچونی کەسێتی هستیری.
- تێکچونی کەسێتی نێرگزی ( تاوسی ).

٣- کۆمەڵەی دڵەراوکێ:

- تێکچونی کەسێتی خۆبەدوورگەر.
- تێکچونی کەسێتی واسواسی .
- تێکچونی کەسێتی وابەستە ( پشتبەستوو ).

### کۆمەڵەی گوماناوی:

١- تێکچونی کەسێتی گوماناوی

- ئەم کەسانە بەوە جیادەکرێنەوە بەردەوام گومانیان لە دەوروبەر هەیە تەنانەت کەسە نزیکەکانی خۆشیان و بڕیارەکانیان لەسەر هەندێ بەڵگەی لاواز دەدەن و هەندێجار بەبێ بەڵگە بەڵکو بەشێکە لە وەهم .
- لە ڕەفتاریاندا زۆر توندن و ئازاری دەوروبەر دەدەن و پەشیمان نین لەو کارانەی دەیکەن.
- ژمارەیەکی کەم هاوەڵیان هەیەو ناتوانن باوەڕ بە کەس بکەن.

٢- تێکچونی کەسێتی شیزی:

- تاکەکانی خاوەن ئەك کەسێتیە ئارەزوی پەیوەندی کۆمەڵایەتی ناکەن و ڕێگەشی پێنادەن.
- لە رووی سۆزدارییەوە زۆر ساردن.
- بواری چالاکی و ئارەزیان زۆر سنوردارە لە چەند ئارەزویەکی کەم تێپەر ناکات و هەمیشە لەو ئارەزوانەیە کە بە تەنیا دەکرێت و پێویستی بە هاوەڵ نیە وەکو کۆمپیوتەر، راوە ماسی .... هتد.
- بە پێچەوانەی کەسێتی گوماناوی گوێنادات بەو رەخنانەی ئاراستەی دەکرێت.
- زوربەیان بە رەبەنی دەمێننەوە بەهۆی لاوازی پەیوەندی کۆمەڵایەتی.

٣- تێکچونی کەسێتی شیزی بچوك یان هاوشیزی

- زیاتر حەز بە گۆشەگیری دەکات و بیروڕای نامۆی هەیە و زۆربەی شتەکان دەداتە پاڵ جادو و جنۆکە .
- رقتی هەیە لە بیرکردنەوەدا ، لاوازی سۆزداری.
- دەشێ گوێی بیستی دەنگێك ببێ یان شتێ ببینێ کە کەسانی تر نایبینن یان نایبیستن.

گروپی سۆزداری یان هەڵەشەیی

٤- تێکچونی کەسێتی دژەکۆمەڵ

- ئەم تاکانە بەوە دەناسرێنەوە کاری نایاسایین زۆرە بەردەوام بەرێی دادگاو بەندیخانەکانەوەن.
- ویژدانیان نیە و بەزەییان بە قوربانیەکانیاندا نایەتەوە و زۆرجار لەو ئازاردانە چێژ وەردەگرن.
- کەسێکی هەڵپەرستە و شوێن بەرژەوەندیەکانی خۆی دەکەوێ ئامادەیە لەو پێناوەدا هەموو بێوەفاییەك و ناپاکیەك بنوێنێ بەرامبەر کەسە نزیکەکان و دڵسۆزەکانی.
- کەسێتی درۆزن و فێلبازە.
- کەسێکی هەڵەشەیە لە رەفتارەکانیا و لە پەیوەندیە سێکسیەکانیاندا.

٥- تێکچونی کەسێتی ناجێگیر

- تاك هەڵناكات بە تەنیا بێت.
- بە خێرایی پەیوەندی كۆمەڵایەتی دروست دەكات.
- بە پەلەو هەڵەشەیی بریار دان لایەنی كەم لە دوو بوار لە مانەی خوارەوە:
  - سەرفكردنی پارە بە شێوەیەكی نا ئاسایی.
  - پەیوەندی سێكسی مەترسیدار .
  - بەكارهێنانی مادەهۆشبەرەكان.
  - روداوی رێی بان.
  - زۆرخۆری بە شێوەیەكی نائاسایی.
- هەوڵدانی خۆكوژی و زیان گەیاندن بە خۆد.
- هەستكردن بە بە تاڵی و بێزاری.
- واهەست دەكات كەسێكی خراپە.

٦- تێكچونی كەسێتی هستری

- هەوڵ دەدات سەرنجی دەوروبەر رابكێشێت.
- هەوڵ دەدات سەنتەری گفتوگۆ خۆی بێت لە نێو خەڵكیدا.
- لە كاتی باسكردنی بابەتەكان زیادە رەوی دەكات كاتی باسكردنی رووداوێك یان وەسفكردنی خواردنێك یان نیشانەی نەخۆشیەك.
- هەوڵ دەدات لە كاتی دەربرینی بۆچونەكانیدا زیادەرۆیی بكات بەبێ بوونی بەڵگە و فەلسفەبازی دەكات لە قسەكانیدا.
- بە ئاسانی بە بیروباوەری دەوروبەر كاری تێدەكرێت..
- سۆزێكی بەهێز دەنوێنێ بەرامبەر دەوروبەر زۆر بە خێرایی دەگۆرێ بۆ بارێكی تر.
- كەسێكی خۆپەرستە.

٧- تێكچونی كەسێتی نێرگزی (تاوسی)

ئەم كەسێتیە ناوی لە ئەفسانیەكی یۆنانیەوە هاتوە كە لاوێك زۆر جوان دەبێ ، لە قەراغ رووبارێك دادەنیشێ هێندە سەرسامە بە جوانیەكەی تا مردن دەروانێتە خۆی.

• زۆر لە خۆی ڕازیە لە هەموو بوارەکاندا.

• داوای خزمەتگوزاری لە دەوروبەر دەکات بەڵام بەخشندە نیە.

• هەوڵدەدات سەرنجی دەوروبەر ڕاکێشێ بەڵام گوێ ناداتە خەڵکی.

**کۆمەڵەی دڵەراوکێ:**

١- تێکچونی کەسێتی خۆبەدوورگەر.

• هەست بە دڵەراوکێ و چاوەڕوانی بەردەوام دەکات.

• وا هەست دەکات لە کەسانی تر کەمترە.

• زۆر هەستەوەرە بەرامبەر بە ڕەخنە.

• هەوڵ دەدات خۆی بپارێزی لە ڕووبەڕوبونەوەی ڕاستەوخۆ لەگەڵ خەڵکیدا.

• تەنها یەك دوو هاوەڵی هەیە ناتوانێت هاوەڵی زۆری هەبێت و لە چالاکیە کۆمەڵایەتیەکاندا وابەستە دەبێت بەو کەسانەوە لە بڕیاری بەشداری کردندا.

• خەمخۆری کەسانی ترە.

٢- تێکچونی کەسێتی واسواسی و ڕارایی.

• زۆر بایەخ دەدات بە ڕێکخستنی کەلوپەلەکان ، کاتێکی زۆر دەفەوتێنێ بەرێکخستنی پۆشاك و کتێبخانەو ..... هتد .

• بە شوێن مسالیەتدا دەگەڕێ زۆرجار وا دەکات کارەکە بە ئەنجام نەگەیەنێ.

• زۆر بەدڵسۆزانە کاردەکات ئەمەش دەبێتە هۆی زیان گەیاندن بە پەیوەندی کۆمەڵایەتی.

• هەموو کارێك خۆی پێی هەڵدەستێ چونکە خاوەن ویژدانێکی زیندووە.

• ڕەق و توندە لە کارو لە خۆی نابورێ بەرامبەر کەمتەرخەمی.

• کەسێکی دەست بڵاو نیە و لەو باوەڕەدایە ماڵی سپی بۆ ڕۆژی ڕەش باشە.

• بە زەحمەت (بەگران) لەگەڵ بارودۆخی تازەدا دەگونجێت.

• زۆر بایەخ دەداتە وردەکاری بابەتەکان و دەترسێ لە هەڵە کردن.

**تێبینی:**

▪ دەبێت جیاوازی بکەین لە نێوان تێکچونی کەسێتی واسواسی و پەشێوی واسواسی . ئەوەی یەکەم هەر لە منداڵیەوە هەیەو لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا زیاتر

دەچەسپێ و تــاك ژيــانی خــۆی بەســەر دەبــات ، لــە كــارو پيــشەدا دەشــێ لــە زۆر كــەس بــە توانــا تــر و بەرهــەم هێنــەرتر بێــت بــەهۆی دڵــسۆزی و دابرانــی بــۆ كارەكــەی، لەكاتێكــدا ئــەوەی پەشــێوی واسواســی هەيــە لــە ماوەيــەكی كورتــدا نيــشانەكان ســەرهەڵدەدەن و كاردەكەنــە ســەر ژيــانی تــاك و پێويــست دەكــات دەرمــان بەكاربهێت بۆ چاكبونەوە .

- هــەردوو حاڵــەت ( تێكــچونی كەســێتی واسواســی و پەشــێوی واسواســی ) بــە هــيچ جۆری پەيوەندی بە جنۆكەوە نيە.

٣- تێكچونی كەسێتی وابەستە ( پشتبەستوو )

- ناتوانێت بڕياری كاری رۆژانەی بدات بە بێ وەرگرتنی ئامۆژگاری و رێنمايی.
- بە گران دەتوانێت بڕياری دەستپێكردنی كار و پرۆژە بدات.
- هەست بە نائارامی دەكات گەر بە تەنها بێت.
- ئەوەی بەرامبەر داوای دەكات جێبەجێ دەكات گەر بڕواشی بەو كارە نەبێت.
- گەر پەيوەنديەكی تەواو بوو بە پەلە دەوڵ دەدات پەيوەند تر دروست بكات.
- هــەوڵ دەدات لــە زوربــەی شــوێنەكاندا خــەڵك بناســێ تــاكو لــەكاتی پێويــستدا داوای يارمــەتيان لێبكــات بــەلام نــەك بــە شــێوە دروســتەكەی بــۆ نمونــە گــەر يــەكێك بناســێ لــە نەخۆشــخانە كــاتێ كــاری هــەبێ لــەوێ گــەر خۆيــشی بتــوانێ كارەكــە بكــات و كارێكی زۆر ئاسان بێت ئەوا دەوا دەكات لەو كەسە كارەكەی بۆ بكات.

ســەرەرای ئــەو جۆرانــەی لەســەرەوە باســمــان كــرد هەنــدێ جــۆری كەســێتی تــر هــەن كــە لە پۆلێنەكەی سەرەوەدا نين:

١-كەسێتی سلبی توندوتيژی:

- هەڵناسێت بەكارەكانی .
- گلەيی ئەوە دەكات كە دەوروبەر لێی تێناگەن و رێزی ناگرن.
- رق و نێرەيی هەيە بەرامبەر بەوانەی سەركەوتوو بە توانان لە كارەكانياندا.
- بەردەوام رەخنە لە دەستەلات و حكومەت دەگرێ.
- زوربــەی كــات هــاورای دەســت ناكــەوێ بــەردەوام لــە هەڵبــەز و دابەزايــە لــە نێــوان غيرەت و توندی و پەشيمانی.

نمونــەی ئــەم تاکانــە زۆرە لــە کۆمەڵگــەدا ئــەو فەرمانبــەرەی ســەردانی دەکــەیت لــە یــەکێك لــە دامــەزراوەکانی حکومەتــدا بــەردەوام خــەریکی ڕەخنــەو قســەی زلــە بــەڵام کاتێــك کــارت دەبــێ لای زۆر بــە ئاســانی دەڵــێ ســبەینێ وەرەوە ، ئــەم کــارە نــاکرێ بــەبێ بوونی هیچ پاساوێك دوور نیە ئەو کەسانە لەم جۆرە کەسێتیە بن.

٢- کەسێتی خەمۆك:

تــاك بــەوە جیادەکرێتــە بــەردەوام لــە حاڵــەتی خــەمۆکی و کــەمی هەوەســدایە بــەڵام ئەمانــە ڕێگــر نــین لــە ژیــانی و زۆر کــەیفی بــە تێکــەڵ بــوون و چــالاکی تــەنز ئــامێز نایــەت و لۆمەی خۆی دەکات لەمەر شتی سادە و زۆربەی کات ڕەشبینە بەرامبەر ڕوداوەکان.

## هۆکاری توشبوون:

تێکــچونی کەســێتی وەك ســەرجەم حاڵەتــە دەرونیــەکانی تــر زیــاتر لــە هۆکارێــك دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی، گرنگترینیان:

١- پــەروەردەکردن: پــەروەردەکردنی منــداڵ کاریگــەری ئاشــکرای هەیــە لەســەر ژیــانی ئاینــدەی ، توندوتیــژی جەســتەیی و سێکــسی ،توندوتیــژی خێزانــی ،خواردنــەوەی مــەی بەڕێژەیــەکی زۆر لــە لایــەن باوانــەو هانــدانی منــداڵ بــۆ بــەکارهێنانی ئــەو مادانە دەشێ سەرەتایەك بێت بۆ تێکچونی کەسێتی.

٢- گرفتــە ڕەفتاریــەکانی منــداڵ و بــونی هەنــدێ پەشــێوی لــەو قۆناغــەدا ئەگــەری تێکچونی کەسێتی لە ئایندەدا زیاتر دەکەن.

٣- ناتەواویــەکانی مێــشك : کــەمی ئاســتی هەنــدێ لــە وەرگرەکــانی مێــشك و کــەمی چــالاکی هەنــدێ ناوچــەی مێــشك و گۆڕانکــاری لــە هێلکــاری مێــشکدا لــەو کەســانەدا بەدی دەکرێت کە تێکچونی کەسێتیان هەیە.

## تێبینی:

نــاتوانین لــە ڕێــی پــشکنینی خــوێن یــان تیــشکە بەردایــەوە کەســێتی تــاك دیــاری بکەین .

ئەو هۆکارانەی کەسێتی بەرەو خرا پی دەبەن:

- بەکارهێنانی ئەلکحول و مادە هۆشبەرەکان.
- نەگونجاندن لەگەڵ خێزان و کۆمەڵ.

- گرفتی دارایی بەتایبەتی چاوەڕواننەکراو.
- توشبوون بە پەشێویە دەرونیەکان.
- بوونی نەخۆشیە درێژخایەنەکان لە سەرەتای تەمەنەوە.

## چارەسەر

١- چارەسەری دەرونی:

زیاتر لە ڕێگەیەک هەیە تاک دەتوانێت سودمەند بێت لێی لەڕێی گوێگرتن و ئاخاوتنەوە.بۆ نمونە لە ڕێی چارەسەری دەرونی داینامیکی دەروانێتە کاریگەری ڕوداوەکانی ڕابردوو لەسەر کەسێتی تاک لە ئێستادا. ڕێگەی مەعریفی شیکاری دەروانێتە ئەو ڕەفتار و پەیوەندیانەی تاک کە بێ سودن و هەوڵی گۆڕینیان دەدات.چارەسەری مەعریفیش بۆ گۆڕینی بۆ چونە هەڵەکانی تاک بەکاردێ ، کۆمەڵگەی چارەسەری شوێنێکە تاک سەردانی دەکات و دەتوانێت تێیدا بمێنێتەوە بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک تا چەند مانگێک لەرێ کەسانی شارەزاوە هاوکاری دەکرێت بۆ زاڵبوون بەسەر گرفتەکانیدا و سود وەرگرتن لە تاقیکرنەوەی کەسانی تر و ناوەندێکە بۆ کاروچالاکی کە تاک هەست بە بوونی خۆی دەکات و بەبێ ڕەخنەگرتنێکی توند هەوڵ دەدرێت گۆڕانکاری لە تاکدا بکرێت.

٢- چارەسەر بە دەرمان:

- دەرمانی دژەسایکۆسس: بۆ گروپی گومانـاوی و تێکچونی کەسێتی ناجێگیر بەسوودە بۆ کەمکردنەوەی نیشانەکانیان.
- دەرمانی دژەخەمۆکی: گروپی دووەم و سێهەم تا ڕادەیەکی باش سوود لەم دەرمانانە وەردەگرن.
- دەرمانی جێگیرکردنی مەزاج وەکو لیسیۆم، کاربامازپین، سۆدیۆم ڤالپرۆید بەسوودە بۆ گروپی یەکەم و هەندێ لە تێکچونەکانی گروپەکانی تر.

بەربڵاوی تێکچونی کەسێتی لەنێوان نەخۆشیە دەرونیەکاندا لە ٣٠٪-٤٠٪ ئەوانەی سەردانی پزیشکە دەرونی دەکەن و لە ٤٠٪-٥٠٪ ی ئەوانەی لە نەخۆشخانە دەرونیەکاندا دەخەون تێکچونی کەسێتیان هەیە مەرج نیە وەك هۆکاری یەکەمی دەستنیشانکردن .

ئەوانـــەی وەکـــو حاڵـــەتی تێکـــچونی کەســـێتی دەستنیـــشان دەکـــرێن نزیکـــەی لــــە ٥٪-١٥٪ دەبێـــــت. ئەوانـــــەی لــــە بەندیخانــــەکانن نزیکــــەی لــــە ٢٥٪-٧٥٪ یــــان تێکـــچونی کەسێتیان هەیە.

## تێبینی :

ئــــەو ڕێژانــــەی ســــەرەوە تایبەتــــە بــــە کۆمەڵگــــە ئەورپیــــەکان بــــەڵام لــــە کۆمەڵگــــەی خۆماندا ڕێژەکە زۆر زۆر لەوە کەمترە.

## ئایندەی تاك

بــــە پێی تێپــــەربوونی کــــات هەنــــدێ لــــە تێکــــچونە کەســــێتیەکان بــــەرەو باشــــبوون دەرون بەتایبــــەتی ڕەفتــــاری دژەکۆمــــەڵ لــــە گرێــــی چــــوارەم و پێنجــــەمی تەمەنــــدا کــــەم دەبێتــــەوە و هەندێ لە تێکچونە کەسێتیەکان لە ئایندەدا دەبنە پەشێوی دەرونی.

# ئەلكحول و مادە هۆشبەرەكان

# Alcohol and Substance abuse

لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین باس لە خراپ بەكارهێنان و ئالوودە بوون بە ئەلكحول و مادەهۆشبەرەكان بكەین، وەك هەمووان دەزانن لەم ساڵانەی دواییدا بە رێژەیەكی بەرچاو بەكارهێنانی ئەم مادانە لە نێوان تاكەكانی كۆمەڵدا روولەزیاد بوونە بەتایبەتی توێژی لاوان و هەرزەكاران و ئەوەش تێبینی دەكرێ لەم ساڵانەی دواییدا رەگەزی مێینەش لەبەر هۆیەك یان هۆیەكی تر هەندێ لەم مادانە بەكاردێنێ.

بە پێ ڕێكخراوی تەندروستی جیهانی ساڵانە :

نزیكەی ١,٨ ملیۆن هاوڵاتی بەهۆی كاریگەری مەی خواردنەوە دەمرن .

٥٨,٣ ملیۆن ﴿پەنجاو هەشت ملیۆن سێ سەد هەزار﴾ حاڵەتی پەككەوتەیی خۆگونجاندی ژیان روودەدات.

ئەلكحول بەرپرسە لە ٢٠٪ - ٣٠٪ حاڵەتەكانی شێرپەنجەی سورێنچك و جگەر و بەریشاڵبوونی جگەر و خێزان كوژی و پەركەم و رووداوی رێ و بان.

لە بەریتانیا نزیكەی ٩٣٪ ی پیاوان و ٨٧٪ ی ژنان ئەلكحول دەخۆنەوە.

## چەند پێناسەیەك:

١- ئالودەبوون: هەركاتێ تاك سیان یان زیاتر لەم تاییە تمەندیانە خوارەوەی هەبێ:

- تاك پێویستی بەربڕێكی زیاتر بێت لەو مادەیە تاكو بگاتە هەمان بار، واتە پێویستی بەوە دەبێت ئەو بڕەی دەیخوات زیاتری بكات تاكو هەمان حاڵەتی پێشوی بۆ بێتەوە كە بەبڕێكی كەم بەدەستی هێناوە.یان دەتوانین بڵێین كەمبونەوەی كاریگەری مادەكە گەر هەمان بڕ بەكاربهێنێت.
- نیشانەكانی لێگرتنەوە: هەر كاتێ تاك هەوڵ بدات مادەكە نەخوات یان ئەو بڕەی دەیخوات كەمی بكاتەوە ( لەبەرهەرهۆیەك دەست نەكەوتن، نەخۆشی ، نەبونی پارە بۆ كرین...... ) هەندێ نیشانەی جەستەیی و دەرونی لە تاكدا بەدەردەكەون كە نارەحەتی دەكەن بۆیە جارێكی تر بەكاردێنێتەوە تاكو لەو نیشانانە خۆی رزگاربكات.

• بەکارهێنانی مادەکە( مژادەکە ) بە بڕێکی زیاتر و بۆ ماوەیەکی درێژتر لەوەی پلانی بۆ داناوە لە سەرەتادا.
• حەز و هەوڵی سەرنەکەوتوو بۆ وازهێنان ، تاك چەند جارێك پە یمان بە خۆی و دەوروبەری دەدات کە وازبێنێت بەلام پاش ماوەیەکی کەم دەگەڕێتەوە سەر بەکارهێنان بەهۆی دەرکەوتنی نیشانەکانی لێکرتنەوە یان بەهۆی گەڕانەوە بۆ هەمان ناوەند ﴿ هاوڕێی خراپ یان کارکردن لەو شوێنانەی ئەو مادانەی بەئاسانی تێدا دەست دەکەوێت﴾.
• بەسەربردنی کاتێکی زۆر بۆ بەدەست هێنانی ئەو مژادانە یان بەکارهێنانی یان پێویستی بە کاتێکی درێژ دەبێت بۆ هۆشهاتنەوە و گەڕاندنەوە بۆ باری پێش بەکارهێنان.
• پشتگوێ خستنی گەلێ چالاکی کۆمەلایەتی گرنگ یان گوێ نەدان بە کار و پیشە بەهۆی بەکارهێنانی ئەم مژادانەوە.
• بەردەوام بوون لە بەکارهێنانی ئەم مادانە سەرەڕای ئەوەی دەزانێ ئەم مادانە زیانی جەستەیی و دەروونی هەیە یان باری جەستەیی و دەروونی خراپتر دەکات.

٢- خراپ بەکارهێنانی مژاد: دەبێ بزانین جیاوازیەکی گەورە هەیە لە نێوان خراپ بەکارهێنان و ئالوودە بوون هەموو کەسێك کە ئالودە بووبێ ئەوە تاکێکە ئەو مادانەی خراپ بەکارهێناوە بەلام هەر تاکێك ئەو مادانەی خراپ بەکارهێنا مەرج نیە ئالودەبووبێ.

بە پێی مانوەلی دەستنیشانکردن و پۆلێن کردنی پەشێویە دەروونیەکان هەر کەسێك یەکێك یان زیاتر لەمانەی خوارەوەی هەبێت بە تاکێك دادەنرێت کە خراپ بەکارهێنەری مژادە:

• دووبارە بەکارهێنانەوەی مژاد لە شوێنی مەترسیداردا وەکو کاتی لێخوڕینی ئۆتۆمۆبیل.
• دووبارە بونەوەی کێشەیی یاسایی بەهۆی بەکارهێنانی ئەم مژادانەوە.
• بەردەوام بوون لە بەکارهێنانی ئەم مژادانە سەرەڕای گرفتی کۆمەلایەتی و پەیوەندی کەسێتی بە هۆی ئەم مژادانەوە.
• جێبەجێ نەکردنی ئەو پەیمانە گرنگانەی کە دەیدات.

٣- پشتبەستنی فسیۆلۆژی: مانوەلی دەستنیشانکردن و پۆلێن کردنی پەشێویە دەروونیەکان پێناسەی دەکات بە بوونی ڕاهاتن یان بوونی نیشانەکانی

# پۆلێن کردنی مژادەکان

Classification of substances

بــە پێــی مــانوەلی دەستنیــشانکردن و پــۆلێن کردنــی پەشــێویە دەرونیــەکان ئــەو مژادانــەی دەبێتــە هــۆی ئــالودەبوون یــان خــراپ بــەکاردەهێنرێت پــۆلێن دەکــات بــۆ ١٣ گرۆپ یان کۆمەڵە :

١- ئەلکحول.

٢- ئەمفیتامین.

٣- کافایین.

٤- کانابیز.

٥- کۆکایین.

٦- هالۆجینەکان.

٧- هەمژەرەکان.

٨- نیکۆتین.

٩- ئۆپیەیدەکان.

١٠- فنسایکلیدن.

١١- دژەدڵەراوکێکان و هێورکەرەوەکان.

١٢- فرەمژادەکان.

١٣- ئەوانی تر ( دجیتال ، ئەمیل نایترەیت ).

# ئەلكحول

# (Alcohol)

ئـــەلكحول يەكێكـــە لـــەو مادانـــەی لەسەرانـــسەری جیهانـــدا بـــەكاردەهێنرێ ســـەرەڕای ئـــەوەی هـــەمووان كـــۆكن لەمـــەر زیانـــەكانی لەســـەرجەم بوارەكـــانی ژیانـــدا ، ســـەبارەت بـــە تەندروســـتی تـــاك ( لەهـــەردوو لـــەرووی جەســـتەیی و دەروونییـــەوە ) و كاریگـــەری خراپـــی لەســـەر ژیـــانی تـــاك لـــەرووی كۆمەڵایـــەتی و خێزانـــی و كاریگـــەری ئـــابووری و ئایینی.....هتد.

## جۆرەكانی ئاڵوودە بوون :

بە پێ جیلینك ( پێنج جۆر ئاڵوودەبوون هەیە ):

1- جـــۆری ئـــەلفا : تـــاك لـــەم بـــارەدا تـــەنها پـــشت بەســـتنی دەروونـــی هەیـــە واتـــە بۆیـــە دەخواتـــەوە تـــاكو هەســـت بەشـــادمانی بكـــات و برێـــك خـــۆ بپـــارێزێ لـــە كێـــشەی ڕۆژانە.

2- جـــۆری بیتـــا : لـــەم بـــارەدا زیانـــە لابەلاییـــەكان دەردەكـــەون ســـەرەڕای ئـــەوەی هێـــشتا پشت بەستنی لاشەیی رووی نەداوە.

3- جـــۆری گامـــا : لـــەم بـــارەدا تـــاك هەڵدەســـتێ بەخواردنـــەوەی مەشـــروبی خەســـت ( ڕێژەیـــەكی زۆر ئـــەلكحولی تێدایـــە ) لەماوەیـــەكی كەمـــدا تـــاكو مەســـت دەبـــێ. ئـــەم جۆرە زیاتر لە بەریتانیا و ئێرلەندەدا هەیە.

4- جـــۆری دەلتـــا : لـــەم بـــارەدا تـــاك برێكـــی زۆر ناخواتـــەوە بـــەڵكو بەشـــێوەیەكی بـــەردەوام دەخواتـــەوە بـــە جۆرێ بـــەردەوام برێـــك ئـــەلكحول لەخوێنیـــدا هـــەبێ . ئـــەم جۆرە زیاتر لەو ولاتانەدا هەیە كە واین بەكاردەهێنن وەكو فەرەنسا .

5- ئێپـــسلۆن : تـــاك لـــەم بـــارەدا حـــەزێكی نەپـــساوی هەیـــە بـــۆ خواردنـــەوە و دووبارەكردنـــەوەی خواردنـــەوە لـــەنێوان ئـــەو ماوانـــەدا ئاســـاییە ( هاوســـەنگە ) هەنـــدێ وای بـــۆ دەچـــن پەیوەنـــدی هـــەبێ بـــە نەخۆشـــی واسواســـی ( عەمەلیـــەوە ) یەوە.

هەنـــدێ پـــۆلین كردنێكـــی تـــریش هەیـــە بـــۆ خواردنـــەوە ئـــەویش بخۆرەوەكـــان دەكـــات

بە دوو جۆرەوە :

١- سەرەتایی : کە بەبێ هۆیەکی دیار دەخۆنەوە وەکو خواردنەوەی کۆمەڵایەتی ، زیاتر لەو تاکانەدا هەیە کە لە سەرەتایی تەمەندا دەست دەکەن بە خواردنەوە.

٢- دووەمی ( لاوەکی ) : ئەوانەن بەهۆی بوونی هۆکارێکی ترەوە دەخۆنەوە وەکو بوونی نەخۆشی.

## هۆکاری ئالوودەبوون :

بێگومان گەلێك هۆکار هەیە بۆ ئالوودەبوون دەشێ تاك یەکێك یان زیاتری لەو هۆکارانە هەبێت، گرنگترین هۆکارەکان بریتین لە

١- بۆماوە: بەوەی دووانەی یەك هێلکە ئەگەری بەکارهێنانیان زیاترە لە دووانەی دوو هێلکە.

٢- دەوروبەر: لەرێی باوانەوە وەکو لاسایی کردنەوە، منداڵ حەزدەکات لاسایی گەورە بکاتەوە بۆیە کاتێك یەکێك لە باوان بەبەرچاوی منداڵەکەیەوە دەخواتەوە ئەمە وادەکات منداڵ زیاتر ئارەزووی ئەم کارە بکات و بەدزی ئەوانەوە بەکاری بهێنێ گەر بۆ تاقیکردنەوەش بێت. بەڵام هەندێ جار باوان ( زیاتر باوك ) بەبەرچاوی منداڵەکەیەوە دەخواتەوە و تەنها بەوەوە ناوەستێ بەڵکو هەوڵ دەدات تۆزێك بکات بەدەمی منداڵەکەدا و هەندێ جار تاکو ئاستی مەستی دەداتێ تاکو منداڵەکەی بەمەستی ببینێ بەو دیمەنە برێك پێبکەنێ ، لەکاتێکدا ئەو دیمەنە جێی گریانە نەك پێکەنین گەر شتێك شایەنی پێکەنین بێت لەو دیمەنەدا عەقڵی ئەو باوکەیە نەك شتێکی تر ). وەنەبێ رۆڵی سلبیانەی باوان لەو ئاستەدا بوەستێ بەڵکو لەتەمەنێکی دواتر ( هەرزەکاری ) دا باوك زۆر جار منداڵەکەی خۆی دەکاتە هاودەمی خواردنەوەی یان لە بۆنە کۆمەڵایەتییەکاندا داوا لە کورەکەی دەکات بخواتەوە تاکو ئاستی بەرزی کۆمەڵایەتی خۆی راگرێ و پێی نەلێن تۆ تاکێکی دواکەوتویت و لەم پلە کۆمەڵایەتییەدا جێت نابێتەوە !!!

جگە لەباوان برای گەورە و هاوەڵی خراپ و خزم وکەسوکار واتە بوونی پێشەنگێکی خراپ کە هاندەربێت بۆ ئەم کارە.

٣- راگەیاندن : یەکێکی تر لە هۆکارە گرنگەکان کە رۆڵی سلبی و قێزموونی هەیە

رۆڵی ڕاگەیاندنە لەرێی کلیپی گۆرانی و زنجیرەی دۆبلاژکراو و فلیم و زنجیرەی خۆماڵی بەهۆی بوونی کەسانی ناشارەزاو نابەرپرس و ساویلکەو فەریکە رۆشنبیرەوە کە بەرنامەکانیان بۆ دادەرێژن ، ڕاگەیاندنی کوردیش گەر لە لوتکەی دواکەوتنەدا نەبێت لەو بارەیەوە لە ریزی پێشەوەی ئەو ڕاگەیاندنانەیە کە زیانی گەورەی لە هەرزەکار و لاوانی ئەم وولاتە داوە. بیرمان ئەچێ هەندێجار عەقلیەتی تەسکی حیزب وای کردووە ئەو فەریکە رۆشنبیرانە هاندەرین بۆ خواردنەوە.

٤- جۆری پیشە کاریگەری ئاشکرای هەیە لەسەر فێربوونی تاك بۆ خواردنەوە بۆیە ئەوانەی لە بارەکاندا کار ئەکەن ئەگەری بەکارهێنانی ئەلکحولیان زیاترە وەك لە کەسانی تر.

٥- ئاستی ئابووری کاریگەری هەیە نەك تەنها لەسەر فێربوون بەڵکو لەسەر جۆری ئەو مەشروبەی بەکاری دێنێت، تاکی خاوەن سەرمایە مەی گران بەها دەکرێ و تاکی هەژار و لات هەراج کراوەکان.

## زیانەکانی خواردنەوە:

گومانی تێدا نییە خواردنەوە گەلێك زیانی هەیە بەرادەیەك دەتوانرێ نەك کتێبێك بەڵکو چەند کتێبێك لەمەڕ زیانەکانی بنوسرێ لێرەدا برێك لەو زیانانە ئاژمار دەکەین:

١- زیانی لاشەیی :

- ئەگەری تووش بوونی بە نەخۆشییەکانی جگەر ( ١٠ هێندەی ) کەسانی ترە.
- کۆئەندامی دەمار : رەنگە ببێتە هۆی پەرکەم ، پوکانەوەی مێشکۆکە و لاوازی چێوەدەمارەکان و تێك چوونی هاوسەنگی و ئەگەری زیاتری برینداربوونی سەر بەهۆی بەرکەوتنەوە یان کەوتنەوەخوارەوە یان کەوتن بە زەویدا.
- کۆئەندامی سوڕان : بەرزبوونەوەی فشاری خوێن و ئاوسانی ماسولکەکانی دیواری دڵ و تێکچونی لێدانی دڵ و خوێن بەربونی مێشك ( جەلتەی مێشك ).
- کۆئەندامی هەناسە : نەخۆشی سیل و هەوکردنی بۆریەکانی هەواو بەهۆی دابەزینی بەرگری و جۆری خواردن و خۆپشت گوێ خستن.
- کۆئەندامی هەرس: رۆشاندن و برینی گەدە و دوانزەگری، هەوکردنی پەنکریاس( ئەلکحول بە یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکان دادەنرێت ) ، سکچونی درێژخایەن، بونی پیسایی چەوراوی.
- شێرپەنجەی دەم و زمان و گەروو و سورێنچك و جگەر .... لە مەی خۆراندا زۆر

زیاترە وەك لە مەی نەخۆر.

- کەم خوێنی و کەمی فیتامیینەکان بەتایبەتی فیتامینی بی ١ وبی ٦.
- کاریگەری لەسەر توانای سێکسی
  - تاکی مەی خۆر توانا و ئارەزووی سێکی کەمترە لە تاکی ئاسایی( ٥٠٪ ).
  - ژمارەی سپێرمەکانی کەمترە و گوونەکانی دەپوکێنەوە.
  - مەمکەکانی گەورەتر دەبێت.
  - توانـــای رەپیـــوونی ئـــامێنێ یـــان ئـــاتوانێ لـــەو بـــارەدا بمێنێتـــەوە بـــۆ مـــاوەی پێویست ( ٥٠٪ ).
  - نارەحەتی لە هاویشتندا یان توشی حاڵەتی درەنگ هاویشتن دەبێ.
  - توندوتیژی سێکسی زیاترە.
  - حاڵەتی نەزۆکی زیاترە.
  - ئەلکحول دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی ئاستی هۆرمۆنی تێستۆستیرۆن.
- مـــردن: لەوانـــەی برێکـــی کـــەم دەخۆنـــەوە لـــە ناوەنـــدی تەمەنـــدا دوو هێنـــدەی کەســانی تــرە، لــە مێینــەدا لــەوەش زیــاترە وەك لــە هاوشــانە مــەی نــەخۆرەکانیان . لەوانـــەی برێکـــی مـــام ناوەنـــد دەخۆنـــەوە رێـــژەی مـــردن ســـێ هێندەیـــە . لەوانـــەی زۆر دەخۆنـــەوە ٤,٥ هێنـــدەی کەســـانی تـــرە کـــە ناخۆنـــەوە . بـــۆ نمونـــە لـــە بـــەریتانیا ســـاڵانە نزیکـــە ( ٣٣٠٠٠ ) حاڵـــەتی مردنـــی پـــێش وەخـــت تۆمـــار دەکرێـــت بـــەهۆی ئەلکحولـــەوە بـــەهۆی نەخۆشـــییەکانی کۆئەنـــدامی ســـوڕان وجگـــەر و رووداوی رێـــو بان و شێرپەنجە.
- کاریگـــەری لەســـەر کۆرپەلـــە دەبێتـــە هـــۆی ســـەرهەڵدانی نیـــشانەیەکی تایبـــەت کـــە پێـــی دەوتـــرێ نیـــشانەی منـــداڵی ئـــەلکحولی لـــەم بـــارەدا منداڵەکـــە ســـەری بـــچوکە و دەم وچـــاوی ناتەواوییـــەکی ئاشـــکرای هەیـــە و ئاســـتی زیرەکـــی کـــەمترە لـــە منـــداڵی ئاسایی و کێشی کەمە و باڵای کورتە .

بـــەم دواییـــە بۆچونێـــك هەیـــە لـــە نێـــوان زانایانـــدا کـــە زیـــاتر لـــە سەرچـــاوەیەکی پزیـــشکی ئامـــاژەی پێـــدەکات ئـــەویش بریتییـــە لـــەوەی ئەوانـــەی بـــری کـــەمتر لـــە( ٢٠ یەکـــە ئـــەلکحول ) دەخۆنـــەوە لـــە هەفتەیەکـــدا ئەگـــەری مردنیـــان بەنەخۆشـــی دڵ کـــەمترە لەوانەی ناخۆنەوە بەڵام لێرە گەلێ کێشەی گەورە دێتە بەردەممان لەوانە:

یەکـــەم : زەمانـــەت چـــییە لـــەو بـــڕە زیـــاتر ناخوینـــەوە واتـــە چـــۆن دڵنیـــابین تووشـــی

ئاڵوودەبوون نابێن .

دووەم : زەمانەت چیە کە فێری بەکارهێنانی مژادی تر نابێن.

سێهەم : ئەو بڕە مانای ئەوە نییە کە زیانی تری نییە .

چوارەم : هەندێ زیانی ئەلکحول هەیە بە بڕێکی زۆر لەوە کەمتر دەردەکەوێت. وەکو حاڵەتی ژەهراوی بوون بە ئەلکحول ( خواردنەوەی نەخۆشیانە ) (pathological drunkenness – idiosyncratic alcohol intoxication). لەم بارەدا تاك پاش چەند خولەکێکی کەم لە خواردنەوە کە هێندە نیە بگاتە ئاستی ژەهراوی بوون، تووشی وەهم دەبێ و حاڵەتی هەڵوەسەی دەبێ واتە بیستنی یان بینینی هەندێ دەنگ و دیمەن کە بوونی نیە رەفتاری شەرەنگێزانەی دەبێ کە لەگەڵ هەڵسوکەوتی پێشنیەی تاکدا ناگونجێ واتە بەتەواوی کەسێکی ترە لەو کاتەدا دەشێ زیان بە خۆی یان کەسانی تر بگەیەنێت لە ژێر کاریگەری ئەو وەهم و هەڵوەسانەی کە هەیەتی.

پێنجەم: لە رووی ئاینیەوە هەموو بڕێکی ئەلکحول کەم بێت یان زۆر حەرامە .

٢- زیانە دەروونییە کانی خواردنەوە:

- گۆڕان لە کەسێتی دا، وورده وورده دابڕانی لە کۆمەڵ و لاوازبوونی پەیوەندییەکانی.
- پەیوەندی ئەلکحول بە تەنگژەکانی مەزاجەوە بڕێك ئاڵۆزە چونکە هەندێجار تاك تاکو زاڵ بێت بەسەر خەمۆکیدا بڕێکی زیاتر مەی دەخواتەوە بەلام خواردنەوەی مەی بەرێژەیەکی زۆر دەبێتە هۆی خەمۆکی ، ئەم پەیوەندییە بەئاشکرا دیارە لەوانەی لە نەخۆشخانەکان داخل دەکرێن کە دەگاتە نزیکەی لە سەدا ( ٤٢٪ ) لە نێرینەدا بەلام ئەم پەیوەندییە کەمتر روونە لە دەرەوەی نەخۆشخانە واتە لە واقیعی کۆمەڵگەدا ، پاش مانەوەی لە نەخۆشخانە بۆ ماوەی ( ٤هەفتە ) ئەم بارە کەم دەکات بۆ نزیکەی ( ٥٪ ).
- خۆکوشتن لە کەسانی مەی خۆردا شەش هێندەی کەسانی ترە و ئەوانەی لە نەخۆشخانە داخل دەکرێن بۆ چارەسەری کێشەکانی مەی خواردنەوە لە ٨٪ یان خۆیان دەکوژن لە ماوەی چەند ساڵی ئایندەی پاش داخل بوون. گەلێك هۆکار هەن ئەگەری خۆکوشتن زیاد دەکەن لەوانە:
  - بەردەوام بوون لەسەر خواردنەوە.

- بوونی حاڵەتی خەمۆکی.
- نەخۆشی تر، بەتایبەتی درێژ خایەنەکان.
- بێکاری.
- لاوازی پاڵپشتی کۆمەڵایەتی.

• واهیمە بەتایبەتی لە جۆری واهیمەی خیانەت کە تاك واهەست دەکات هاوسەرەکەی خیانەتی لێدەکات ڕەنگە هۆی ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ،خواردنەوە بە پێچەوانەی ئەو بۆچوونەی هەیە گوایە دەبێتە هۆی بەهێزکردنی لایەنی سێکسی هەموو ڕاستییەکان پێچەوانەی ئەمە دەڵێن بۆیە تاك ناتوانێت کاری سێکسی وەکو جاران بە ئەنجام بگەیەنێت. بۆیە ناچاردەبێت پەنا دەباتە بەر میکانیزمەکانی بەرگری و بانگەشەی ئەوە دەکات کە هاوسەرەکەی خیانەتی لێکردووە.

• هالوسینەیشن: لە کاتی هۆشەنگی تەواودا و تاك بەمە زۆر نیگەران دەبێت و ڕەنگە گوێ رایەلی فەرمانەکانی بێت کە لەلایەن ئەو دەنگانەوە پێی دەوترێت.

٣- زیانەکانی خواردنەوە لەسەر پەیوەندی خێزانی: تاك هەموو بایەخێکی بڕیتی دەبێت لە چۆنێتی پەیداکردنی مەی بڕێکی زۆر لە داهاتی خۆی بۆ ئەو مەبەستە سەرف دەکات و ئەمەش زۆر جار کاردەکاتە سەر باری ئابووری خێزان و وادەکات ئەندامانی خێزان هەڵی بژێوی ژیانیان بدەن لە سەرچاوەی ترەوە کە دەشێ نادروست بێت.

تاك ئامادەیە لەو پێناوەدا درۆ یا دزی بکات تاکو بری پێویستی لە مەی دەست بکەوێت، شەوان درەنگ دێتەوە ، دەبێتە میوانی بار و یانەکان و هاوەڵەکانی زۆربەی هاوشێوەی خۆیین و بایەخ دانی بە کێشەکانی خێزان کەم دەبێتەوە و لە جیهانێکی تایبەت بەخۆی دەژی و پەیوەندی لەگەڵ ئەندامانی خێزان کەم دەبێتەوە و کەمترین ماوە لەگەڵ ئەواندا بەسەردەبات و زۆر جار بەربەستێك دروست دەبێت لەنێوان ئەو و ئەندامانی تری خێزاندا کەوادەکات متمانەی پێنەکەن وهاوبەشی نەکەن لەکێشەکانی خۆیان.

دەشێ بەهۆی ئەمەوە ئەندامانی تری خێزان فێری هەمان ڕەفتار ببن و ئەم خۆی هاندەریان بێت و بۆ ئەوەی کەش و هەوای تایبەتی هەبێ وداوای هەندێ شتی نەشیاویان لێبکات وەکو بینینی ڕۆڵی ئەو سۆزانیانەی کە بەناوی هونەرەوە

سەمادەکەن و هونەری سەماکردنیش دەشێوێنن و ئەمیش ڕۆڵی پیاوە چوار پێکە دەبینێ کە بەدەوری سەماکەردا دەسورێتەوە، ناوبەناو سەماکەر سواری دەبێ !!!

ئەمە سەرەڕای ئەوەی لەرووی سێکسیەوە لاواز دەبێت ونـاتوانێ بەشێوەی جاران بە هەمان چالاکی پەیوەندی لەگەڵ خێزانەکەیدا هەبێ و تووشی واهیمەی خیانەت دەبێ و ڕەنگە بگاتە ئاستی ئەوەی خێزانەکەی تەلاق بدات یان بیکوژێت و هەندێ جار منداڵەکانی و خۆیشی دەکوژێت.

ڕێژەی تالاق دان لەنێوان مەی خۆراندا زیاترە وەك لە خێزانەکانی تر ، هەروەها خێزانی ئەو پیاوانەی دەخۆنەوە زیاتر ئەگەری توشبوونیان هەیە بە دڵەراوکێ وخەمۆکی و دابرانی کۆمەڵایەتی.

پەیوەندی سێکسی نادروست لەگەڵ تابۆدا واتە لەگەڵ کەسانی پلەیەك و ئەوانەی ناشێ کاری سێکسیان لەگەڵ بکرێت لە نێوان مەی خۆراندا زۆر زیاترە وەك لە کەسانی تر و چیرۆکی دەست درێژی کردنە سەر خوشك و دایك وخێزانی باوك لە نێوان مەی خۆراندا شتێکی نامۆ نییە.

کاریگەری خواردنەوە بە پێ ئەو بڕەی تاك دەیخواتەوە دەگۆڕێت بەم جۆرەی خوارەوە:

| کاریگەری کەم لەسەر باری کۆمەڵایەتی و تەندروستی | نێر بڕی کەمتر لە ٢٠ یەکە /هەفتە<br>مێ کەمتر لە ١٤ یەکە/هەفتە |
|---|---|
| کاریگەری مام ناوەندی لەسەر باری کۆمەڵایەتی و تەندروستی | نێر بڕی ٢١-٥٠ یەکە /هەفتەیەکدا<br>مێینە بڕی ١٥-٣٥ یەکە/ هەفتەیەکدا |
| کاریگەری زۆر لەسەر باری کۆمەڵایەتی و تەندروستی | نێر بڕی زیاتر لە ٥٠ یەکە / هەفتە<br>مێ بڕی زیاتر لە ٣٥ یەکە/ هەفتە |

## مەبەستمان لە یەکە چییە؟

نزیکەی ٨ گرام ئەلکحول یەکسانە بە یەك یەکە لەم خشتەیەی خوارەوەدا ڕێژەی سەدی ئەلکحول لە هەندێ جۆری مەشروبدا روون کراوەتەوە لەگەڵ ئەوەی هەریەکەیان چەند یەکەیان تێدایە:

| جۆری مەشروب | ڕێژەی سەدی ئەلکحول | یەکە |
|---|---|---|
| بیرە | ٪٣ | ٢ یەکە / پاینت |
| بیرەی خەست | ٪٥,٥ | ٤ یەکە / پاینت |
| سیدار | ٪٤ | ٣ یەکە / پاینت |
| واین | ٪١٠-٨ | ٧ یەکە /بوتلێك |
| شێری ، پۆرت ، ڤێرمۆس | ٪١٦-١٣ | ١٥ یەکە /بوتلێك |
| ویسکی ، جن ، فۆدگا ، برانتی | ٪٣٢ | ٣٠ یەکە/بوتلێك |

## کێشەی ڕێ وبان:

لەساڵی (١٩٩٠) لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا (٤٤٥٢٩ کەس) بە ڕووداوی ڕێ وبان مردوون کەلە (٪٤١) یان پەیوەندی بە خواردنەوە هەبووە.

ئەوانەی مەی خۆرن پێش کەسانی تر دەمرن بەهۆی:

١- توندوتیژی لە توێژینەوەیەکدا لە ئەمەریکا ئامـاژە بەوە دەدات ٪٢٤ مردن دەگەڕێتەوە بۆ توندوتیژی.

٢- خۆکوشتن لە مەی خۆراندا شەش هێندەی مەی نەخۆرانە.

٣- ڕووداوی ڕێ وبان.

٤- هەوکردنی جگەر وپەنکریاس و سییەکان .....

٥- نەخۆشییەکانی کۆئەندامی سوڕان وەکو بەرزی فشاری خوێن وجەڵتە.

٦- بەدخۆراکی کەمی ڤیتامینەکان بەتایبەتی کۆمەڵەی ڤیتامین بی.

٧- پەرکەم کەلەئەنجامدا زۆرتر تووشی بەرکەوتن دەبێت .

٨- ژەهراوی بوون بەهۆی خواردنەوەی بڕێکی زۆر مەی.

## هەڵسەنگاندن

زیاتر لە پێوەرێك هەیە بۆ هەڵسەنگاندنی باری تاکێکی مەی خۆر بەلام زۆر گرنگە دەبێ زانیاری تەواو لە تاك وەربگیرێ سەبارەت بە :

- لە کەیەوە دەخواتەوە ؟
- چی دەخواتەوە ؟ ﴿ واتە چ جۆرە مەیەك بەکاردێنێ بیرە ، ویسکی ، .... ﴾ چەند دەخواتەوە؟
- لە کوێ دەخواتەوە؟ ( لەماڵەوە یان لە بارەکان )
- لەگەڵ کێدا دەخواتەوە؟ ( بە تەنیا یان لەگەڵ هاوەڵەکاندا )؟
- لە خێزانەکەیاندا کەسی تر هەیە بخواتەوە؟
- هیچ گرفتی خێزانی توشبووە بەهۆی خواردنەوەوە؟
- هیچ گرفتی یان نەخۆشی جەستەیی هەیە بە هۆی خواردنەوە؟
- هیچ پەشێوی دەرونی توشهاتووە بەهۆی خواردنەوەوە؟
- هیچ گرفتی یاسایی توشهاتووە بەهۆی خواردنەوەوە؟
- پێشتر هیچ هەوڵی وازهێنانی داوە کەسەرنەکەوتوو بێت؟
- هۆی چی بوە کە هەوڵی یان هەوڵەکانی پێشووی سەرکەوتوو نەبوون؟
- باری دارایی و سەرچاوەی دارایی چیە؟
- بە نیازە وازبێنێت یان نە؟
- هۆکاری وازهێنان چیە؟ ( گرفتی کۆمەلایەتی ، نابووری ، نەخۆشی جەستەیی یان دەرونی ، گەڕاندنەوە بۆ ئایین..... ).
- هەروەها پێوەری کەیج (CAGE) هەیە ، هەر تاکێکی مەی خۆر دووان یان زیاتری لە را پرسیە هەبێت ئەوە خواردنەوەکەی ئامازە بەخشە بەوەی دەشێ جێی مەترسی بێت.

١- هیچ کات هەستت کردووە کە پێویستە واز لە خواردنەوە بێنیت.

٢- هیچ کاتێ یەکێك هەبووە بێزاری کردبیت بە رەخنەگرتن لەوەی کە دەخۆیتەوە.

٣- هیچ کات لۆمەی خۆت کردووە سەبارەت بەوەی دەخۆیتەوە.

٤- هیچ کات هەبووە بەیانیان لەگەڵ چاو هەڵهێناندا بخۆیتەوە.

ئاشان کەیج دوو پرسیاری تریشی زیاد کرد بۆ ئەوانەی دوو وەلامی بەلێیان هەبێ لەو چوارەی سەرەوە:

١- زۆرترین بری ئەلکحول چەندە کە لە رۆژێکدا بەکارت هێناوە؟

٢- زۆرترین بڕی ئەلکحول چەندە کەلە هەفتەیەکدا بە کارت هێناوە؟

## ئایندەی تاک:

ئەوانەی لە سەرەتای دەست پێکردندان دەتوانن وازبهێنن و نەگەڕێنەوە سەرئەم کارە و ئایندەیان باشە ، بەلام ئەو تاکەی ئەم سیفەتانەی خوارەوەی هەبێ ئایندەی گەش نییە:

١- ئەوانەی تێکچوونی کەسێتیان هەیە بەتایبەتی کەسێتی دژە کۆمەڵ.

٢- ئەوانەی لەرووی کۆمەلایەتییەوە دابراون و بەتەنیا دەژین.

٣- ئەوانەی سزادراون بەبەندکردن بەتاوانی خواردنەوە.

٤- ئەوانەی بێکارن.

٥- ئەوانەی تووشی نەخۆشی هاتوون بەهۆی ئەلکحولەوە وەکو نەخۆشی جگەر و هەوکردنی پەنکریاس وسییەکان .

## چارەسەر

گرنگترین خاڵ لە چارەسەردا بریتییە لەوەی تاک نیازی وازهێنانی هەبێ واتە باوەڕێکی تەواوی هەبێ بەوازهێنان دەنا هەوڵەکان بەفیڕۆ دەچن و تاک پاش ماوەیەك دەگەڕێتەوە سەر خواردنەوە ، بۆیە زۆر گرنگە لەسەرەتادا کاتی پێویست تەرخان بکەین بۆ گوێ گرتن لە تاك وهەوڵ بدەن قەناعەتی تەواو بکات بە وازهێنان و زیانەکانی خواردنەوەی بۆ باس بکەین بە تەواوی گوێ بگرین لەوەی کە دەیزانێت و ڕاستیە شاراوەکانی تری بۆ روون بکەینەوە و گەر بۆچوونی هەڵەی هەبوو بۆ چوونەکانی بۆ ڕاست بکەینەوە.

چارەسەر دەبێت لەسەر چەند تەوەرەیەك بێت،

١- کۆمەلایەتی: وەك وو تمان خێزان و دەوروبەر کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر تاك بۆیە لە چارەسەریشدا هەمان ڕۆڵی گرنگیان هەیە دەبێت خێزان پاڵپشت و هاندەر بێت بۆ وازهێنان لەم خووە خراپە.

هەوڵدان بۆ گۆڕینی جۆری پیشە بەتایبەتی گەر لە بارەکاندا کاری دەکرد. خۆ گەر بێکار بوو پەیداکردنی کار هەنگاوێکی گرنگە لە چارەسەردا و هەوڵدان بۆ زاڵ بوون بەسەرکاتی بەتاڵدا بە وەرزش کردن یا خوێندنەوە یا هەر چالاکییەکی تر کە ئارەزووی بکات. وازهێنان لەو هاوەڵانەی کە هاندەرین بۆ خواردنەوە و هەوڵدان بۆ

دۆزینەوەی هاوەڵی نوێ.

٢- چارەسەری دەروونی : لەرێی چارەسەری بەکۆمەڵ وچارەسەری بە تەنیا و چارەسەری خێزانی.

٣- بەکارهێنانی دەرمان : ئەو تاکانەی توشی ئالودەبوون بوون پێویستیان بە چارەسەر هەیە بە دەرمان بە تایبەتی لە هەفتەی یەکەمی وازهێناندا تاکو زاڵبن بەسەر نیشانەکانی لێگرتنەوە کە دوای ٤ – ١٢ کاژێر لە دواخوارنەوەوە روودەدات تاک توشی لەرزین و عەرەقکردنەوەو بێخەوی و خێرالێدانی دڵ و دڵتێکەڵ هاتن و رشاندنەوە و بێ ئۆقرەیی و دڵەراوکێ و هەڵوەسە دەبێت، ئەم نیشانانە دەگاتە لوتکە لەماوەی ٤٨ کاژێر و لەماوەی ٢ -٥ رۆژدا دیار نامێنی و تا نیشانەکان توندتر بن ماوەیەکی درێژتر دەخایەنێ.

نزیکەی لە ٥٪ - ١٥٪ یان توشی فێ دەبێت بەتایبەتی لە ماوەی یەکەم ٤٨ کاژێری پاش دواخواردنەوە و دەشێ لە ماوەی هەفتەی یەکەمی دواخواردنەوەدا بێت بۆیە زۆر گرنگە کەسوکار و پزیشك پەلە نەکەن لە ناردنەوەی کەسەکە بۆ ماڵەوە تاکو لەمەترسی بە دوور بن چونکە گەر حاڵەتی بورانەوە روویدات واباشترە لە نەخۆشخانە چارەسەر بکرێت.

لە نزیکەی لە ٥٪ ئەوانەی وازدێنن توشی حاڵەتی وورێنەی لەرزۆکی دەبن (Delirium tremens) دەبن ،کە تاك لەو کاتەدا بیروهۆشی باش نیە و کات و شوێن و کەسەکان ناناسێتەوە و هەڵوەسەی دەبێت ( بینین، بیستن ... ) حاڵەتەکەی بە پێی کات دەگۆرێ لە شەودا خراپتر دەبێت ، لە حاڵەتی زۆر توندا وەهمی دەبێت ،عەرەق زۆر دەکاتەوە و پلەی گەرمی بەرزدەبێتەوە ، ئۆقرەناگرێ ...... .

ئەم حاڵەتە لە ژێر چاودێری ووردی پزیشکدا چارەسەر دەکرێ و رێنمایی و دەرمانی پێویستی بۆ بەکار دەهێنرێ.

## خۆپاراستن:

هەمیشە دەڵێن خۆپاراستن لە چارەسەرکردن باشترە ، بۆیە گەر تاك هەر لەسەرەتاوە خۆی بپارێزێت زۆر باشتر و چاکترە وەك لەوەی کە تووشی ئالوودەبوون بێ ، نیشانەکانی ( ماکەکانی ) بەکارهێنانی تیا دەربکەوێت پاشان بەشوێن چارەسەردا بگەرێ.

لــــە وولاتەیــــەکگرتووەکانی ئەمــــەریکا لـــەنێوان ســــاڵانی (١٩٢٠-١٩٣٣ ) هــــەوڵێکی جدیانــە درا بــۆ ڕێگــرتن لەمــەی خوادنــەوە و کۆمەڵــە یاســایەکی تونــد دانــرا بــۆ سەرپێـچی کەران ، ئەنجامەکەی:

١- ١٢٠٠ کەس لە سێدارەدران.

٢- ٥٠٠٠٠٠ (نیو ملیۆن )کەس بەندکران بەهۆی سەرپێچییەوە.

٣- هەڵمەتەکە سەرنەکەت و ڕێگەدرایەوە بەهاولاتیان بۆ سەر لە نوێ مەستی!.

ئــەم ڕێگــە پێدانــە لەســەر بنــەمای ســوودو زیــان نــەبوو واتــە لەبــەر ئــەوە نــەبوو کەمــەی ســوودی هەیــە بــەڵکو لەبــەر ئــەوەی هەڵمەتەکــە ســەرکەوتنی بەدەســت نــەهێنا! ئەتوانین گرنگترین ڕێگەکانی خۆپاراستن و بەرەنگاربوونەوە ئاژمار بکەین بە:

١- کەم کردنەوەی بەرهەم هێنانی ئەلکحول.

٢- کــەم کردنــەوەی هێنــانی مــەی لــەدەرەوەی وولات و دانــانی بــاجی زۆر تــاکو نرخــی بەرز بێتەوە کڕینی لە توانانی زۆربەی کەسدا نەبێت.

٣- کەم کردنەوەی ڕێژەی ئەلکحول لە گیراوەکاندا.

٤- دانــانی چــاودێری تەندروســتی لــە کارگــەکانی بەرهــەم هێنــانی ئــەلکحول تــاکو بڕی ئەلکحول زیادنەکرێت لە گیراوەکاندا.

٥- دیاری کردنی شوێنی فرۆشتن و دانای کاتی دیاری کراو بۆ فرۆشتن.

٦- بەرزکردنــەوەی تەمــەنی ئەوانــەی ســەردانی بــاڕ و یانــەکان دەکــەن لــە ١٨ ســاڵیەوە بۆ ٢١ ساڵی .

٧- کــەم کردنــەوەی ڕیکــلام لــە کەناڵــەکانی ڕاگەیاندنــەوە ( تەلــەفزیۆن ، ڕۆژنامــەو گۆڤارەکان.... ).

٨- نوســینی ئاگادارکردنــەوە لەســەر ســەرجەم بوتڵــەکان کــە مەشــروب زیــان بەخــشە وەکو چۆن لەسەر پاکەتی جگەرە دەنوسرێت.

٩- کــەم کردنــەوەی لێــدانی ئــەو فلــیم و زنجیرانــەی کــە پاڵــەوان کەســێکی مــەی خــۆرە و لەهــەمان کاتــدا تــاکێکی نمونەییــە و دڵــسۆزی گــەل و نیــشتمان و بــەها مرۆڤایەتییەکانە!؟.

١٠- دەرکردنی یاسای گونجاو بۆ ڕێگرتن لە مەی خواردنەوە.

١١- زیادکردنی رێنمایی و رۆشنبیری تەندروستی لەمەڕ زیانەکانی ئەلکحول لە خوێندنگە و زانکۆ و پەیمانگاکاندا.

١٢- بایەخ دانی دەروونی و کۆمەڵایەتی بەوخێزانانەی کەتاکێکیان مەی خۆرە تاکو ئەوانی تریش فێری بەکارهێنانی مەی نەبن.

١٣- کاریگەرکردنی رۆڵی پیاوانی ئاینی و کەسانی رۆشنبیر بۆ رێگرتن لەم کردەوەیە.

١٤- رێکخراوەکان و سەنتەرەکانی گەنجان و خوێندکاران و قوتابیان و رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان رۆڵی گەورەیان هەیە لەم بەرەو رووبونەوەیەدا.

تێبینی: زۆر گرنگە هەموو تاکێك بزانێ لە هەر قۆناغێکی خواردنەوەدا بێ دەتوانێ بەسەرکەوتووی وازبێنێت گەر مەبەستی وازهێنان بێ و ئەو بۆ چونە هەڵەیەی لەنێوان خەڵکیدا هەیە ( من تازە ئەلکحول تێکەڵ بە خوێنم بووە ! خوێنم پیس بووە ! بێ خواردنەوە هەڵناکەم ! گەر نەخۆمەوە تێك دەچم ) ئەمانەو گەلێ بۆچوونی هەڵەی تر کە زۆرجار یان هەندێجار دەبنە بەربەست لەوەی تاك بەشوێن چارەسەردا بگەرێ یان هەندێجار تاك دەیکاتە بیانوو ( پاساو ) تاکو وازنەهێنێت . هەندێ هەرزەکاری بەسەزمان بە شانازیەوە دەڵێ من مەشروب تێکەڵی خوێنم بووە رەنگە ئەم وەهمە فرۆشیارەکان فێریان کردبێ تاکو برێکی زیاتر بکرێ و رەواجێ بێ بۆ کاسپەکەیان.

## مادە هۆشبەرەکان

لە دێر زەمانەوە مرۆڤ هەوڵی داوە رێگا چارە بۆ کێشەوگرفتەکانی بدۆزێتەوە هەندێجار لەو باوەڕەدا بووە کە دەرمان یان هەندێ گژوگیا دەتوانن خۆشی پێبەخشن و لە نارەحەتی رزگاری بکەن ، بۆ ئەم مەبەستەش گەلێ گژوگیا و دەرمانی بەکارهێناوە تا رادەیەك ئارامی و خۆشیەکی کاتیان پێبەخشیوە بەلام پاش بە ئاگاهاتنەوە هەمان کێشەونارەحەتی بەردەوام بووە، گەر خراپتر نەبووبی باشتر نەبووە. بێگومان بەڕاکردن و خۆشاردنەوە کێشەکان چارەسەر نابێت.بۆیە

تــاك پــاش ماوەيــەك لــە بــەكارهێنانى ئــەو مادانــە ســەير دەكــات گرفتەكــە لــە يەكــەوە بۆتــە دوو ، ســێ يــان دە ڕەنگــە زيــاتريش. چــونكە گرفتــە ســەرەكيەكە بەردەوامــەو گرفتــى ئــالودەبونيش دێتــە پــاڵى و زيــانى جەســتەيى و دەرونــى و هاوشــانى دەبێــت و بايــەخ نــەدانى تــاك بــە خــۆى و بــە خێــزان كێــشەيەكى تــر يــان چــەند كێشەيەكى تــرى بــۆ دروست دەكــات و زيــانى ئــابوورى بارەكــە گــرانتر دەكــات و دوور نيــە لادان وكێــشەى ياســايش بێتــە پاڵى .

# هێورکەرەوەکان و دژە دڵەراوکێیەکان

## Sedatives, Hypnotics and Anxiolytics

ئــەم کومەڵەیــە برێکــی زۆر دەرمــان لــەخۆ دەگرێــت وەکــو دایازیپــام و ئۆکــسازیپام و کلۆردایەزیپۆکــسایدو لۆرازیپــام و پرازیپــام و ئــەلپرازۆلام و کلۆنازیپــام و فلورەزیپــام و ترایــــەزۆلام و فینۆباربیتــــال و ئــــەمۆباربیتال و پێنتۆباربیتــــال و مپرۆبامێــــت و پارالدیهایت و ......

ئــەم گرۆپــە گــەر مــاوەی دوو هەفتــە بــۆ مانگێــك بــە بــڕی زۆر بــەکاربهێنرێ ئەگــەری ئــالودەبوونی هەیــە ، لــە کــاتی بەکارهێنانیــدا تــاك هەســت بــە ئــارامی دەرونــی و خەواڵویی دەکات.

## نیشانەکانی لێگرتنەوە:

هــەرکاتێ تــاك بیــەوێ بــڕی مادەکــە کــەم بکاتــەوە یــان رایگرێــت لــە مــاوەی ١٢ -٢٤ کــاژێردا نیــشانەکانی لێگرتنــەوە بەدەردەکــەون و لــەماوەی ٤ – ٧ رۆژدا دەگاتــە لوتکــە ، بە پێی جۆری دەرمانەکە دەگۆرێت .گرنگترین نیشانەکان بریتین لە :

- دڵەراوکێ و بێئۆقرەیی.
- دابەزینی پەستانی خوێن لە کاتی وەستاندا.
- لاوازی و لەرزین.
- تا لێهاتن.
- وڕێنەکردن یان بزرکاندن لەبەرخۆیەوە.
- فێلێهاتن.

زۆرجـــار بـــۆ چارەســـەرکردن پێویـــستمان بـــە خەوانـــدنی نـــەخۆش دەبێـــت لـــە نەخۆشخانەو لە ژێر چاودێری پزیشکدا چارەسەری بۆ دەکرێت.

## وروژێنەرەکانی کۆئەندامی دەمار

## Central nervous system stimulants

وەکــــو ئــــەمفیتامین و کۆکــــایین و فیــــنمترازین و مــــیس ئــــەمفیتامین و فینــــل پرۆپــــەنۆلامین. بــــەکارهێنانی دەبێتــــە هــــۆی بــــە ئاگــــایی و زیــــادبوونی چــــالاکی ماســـولکەکان و بەرزبونـــەوەی وورمو حـــەزکردن بـــە یـــاری و قـــسەکردن. خێـــرا لێـــدانی دڵ و بەرزبونـــەوەی فـــشاری خـــوێن و بـــەردەوام بـــەکارهێنانی دەبێتـــە هـــۆی ســـەرهەڵدانی حاڵـــەتی وەهـــم و هەڵوســـە و بـــەکارهێنانی بـــە بـــڕی زۆر ڕەنگـــە ببێتـــە هـــۆی فێلیهـــاتن و لە هۆشخۆچوون و وەستانی هەناسە.

دەتـــوانین نیـــشانەکانی لێگرتنـــەوە بـــە بـــەکارهێنانی دەرمانـــەکانی دژەخـــەمۆکی و نیشانەکانی هەڵوەسەو وەهم بە دەرمانی دژەسایکۆسس چارەسەربکەین.

## هەڵۆسینۆجینەکان ( ئەوانەی هەڵوەسە دروست دەکەن )

## hallocinogens

وەکـــو لایـــسێرجیك ئەســـید دایئیـــسیلەماید( لەســـاڵی ١٩٤٤ لـــە لایـــەن هۆفمانـــەوە دروستکرا ) و سیلۆسیبین و مەسکەلین و فنسایکلیدین.

پـــاش نیوکـــاژێر لـــە وەرگرتنـــی دەرمانەکـــە کاریگـــەری دەردەکـــەوێت و مـــاوەی ١٢ کـــاژێر دەخایـــەنێت و تـــاك لـــەو ماوەیـــەدا هەڵوســـەی جیاجیـــای دەبێـــت بـــە تایبـــەتی هەڵوســـەی بیـــنین و ئـــەم پێکهاتەیـــە لەســـەرەتادا لەلایـــەن نوســـەرەکانەوە بـــەکاردەهێنرا تـــاکو توانـــای ئەفرانـــدنیان زیادبکـــات و چـــیرۆکی ئەفـــسانەیی زیـــاتر بنوســـن . بـــەلام بەهۆی زیانەکانیەوە ڕێگری لێکرا.

پـــاش نـــەمانی کاریگەریەکـــەی تـــاك هەســـت بـــە خـــەمۆکی و دڵـــەڕاوکێ دەکـــات. دەتـــوانین لـــە ڕێـــی دڵنیـــایی کردنـــەوەو هەنـــدێ لـــە پێکهاتـــەکانی بنزۆدازیپینـــەوە چارەسەری حاڵەتە بکەین.

## کانابیز( حەشیش ) ماریجوانا ( ماریوانا )

## Canabis(marijwana) Hashesh

بە پێی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی ١٤٧ ملیۆن هاولاتی حەشیش بەکاردێنن.

شێوازی بەکارهێنان لەڕێی کێشان ، تێکەڵکردن لەگەڵ خواردن . گەر بە شێوازی کێشان بەکاربهێنرێت پاش چەند خولەکێ کاریگەریەکەی دەردەکەوێ و گەر بە شێوازی تێکەڵکردن لەگەڵ خواردندا پاش نزیکەی ٣٠ خولەك.

لەکاتی بەکارهێنانەدا تاك هەست بە ئارامی و شادمانی و زیادبوونی شەهیەی خواردن دەکات و لەهەمان کاتدا دڵی خێرا لێدەدات و دەمی وشك دەبێ و سپێنەی چاوی سووردەبێتەوە و هەندێجار گرفتی دەبێ لە هەستکردن بە کات و شوێن و پلەی گەرمی لەشی دادەبەزێ و هێزی خاودەبێتەوە و دەشێ نۆبەی زوهان رویدات بۆ چەند رۆژێك. لە ڕێی دڵنیایی کردنەوە و دەرمانی پێویستەوە چارەسەردەکرێت.

## ئۆپیەیدەکان

## Opioids

روەکی خەشخاش (papaver Somniferum) لە سەرانسەری جیهاندا دەروێ و بەرزی ئەم روەکە نزیکەی ٣ -٤ پێ دەبێ لە هەر دۆنمێکدا ٤٠ -٦٠ هەزار رووەك دەروێ و نزیکەی ١٠ کغم ئەفیون دەدات ئەمەش بەشی ئەوە دەکات ١ کغم هێرونی لێبەرهەم بهێنرێ.گولەکانی خەشخاش رەنگیان لە سپیەوە تا سوری تۆخ هەیە.

لە روەکی خەشخاشەوە ئەفیون دروست دەکرێ لە ئەفیونەوە مۆرفین لەویشەوە کۆداین و هێرون دروست دەکرێ. ئەفیون وشەیەکی یۆنانیەو بەمانای گوشراو دێت ، جوتیارەکان لە کاتی دوانیوەرۆ یان ئێواران بە چەقۆیەکی تیژ تورەکەی تۆوەکە بریندار دەکەن بە قولیەکی کەم چەند ملیمەترێك پاشان بە جێی دێلن بۆ رۆژی دوایی دەردراوەیەکی لینجی رەنگ بونی( تەلخ ) دێتە دەرێ و بە شتێکی تیژ لە روەکەکە دەکرێتەوە بریتیە لە ئەفیونی سروشتی.

ئـــەفیون بەگـــەلیٚ شـــێوە بـــەکاردەهێنریٚ هـــەر لـــەوەی دەخریٚتـــە ژێـــر زمـــان و لەگـــەڵ خـــواردنی قـــاوەدا دەتوێتـــەوە بـــۆ خـــواردنی لەگـــەڵ ئـــاودا یـــان تواندنـــەوەی لـــە چـــا یـــان لـــە قاوەدا یان کێشانی وەك جگەرە یان نێرگەلە.

هێرونـــی پـــاك و ســـاغ رەنگـــی ســـپییە و ئەوانـــەی دەســـتکاری کـــراون یـــان تێکـــەڵ بـــەمادەی تـــر کـــراون رەنگیـــان بـــۆرە یـــان تێـــرە .هێرونـــی ســـاغ ســـی جـــار (٣٠ جـــار) لـــە ئـــەفیون بـــەهێزترە. نرخـــی یـــەك گـــرام هێـــرون ٥٠ – ١٠٠ یۆرۆیـــە واتـــە (١ کیلـــۆگرام بـــە ٥٠٠٠ – ١٠٠٠٠ یۆرۆیـــە بـــە پێـــی پـــاك و ســـاغی هێرونەکـــە دەگـــۆریٚ) تـــاکی ئـــالوودەبوو رۆژانـــە بـــری ٠,٢٥ – ٢ گـــرام بـــەکار دێـــنیٚ واتـــە گـــەر هێرونـــی ســـاغ بـــەکاربێنیٚ رۆژانـــە ٥٠ – ٢٠٠ یـــۆرۆی دەویٚ و مانگانـــە ١٥٠٠ – ٦٠٠٠ یـــۆرۆ ئەمـــە گـــەر لـــە لایـــەن بانـــدەکان و بازرگانەوە ئیستغلال نەکریٚ چونکە زۆربەیان زۆر زیاتر دەکەویٚ لەسەریان.

بـــە پێی رێکخـــراوی تەندروســـتی جیهـــانی نزیکـــەی ١٢,٥ ملیـــۆن کـــەس ئۆپیەیـــد بەکاردێنن .

نمونـــەی ئـــەم گروپـــە وەکـــو مـــۆرفین و هێـــرون و هایـــدرۆمۆرفین و ئۆکـــسی مـــۆرفین و کۆداین و هایدرۆکۆدۆن و میسادۆن و میپیریدین و ئەلفا پرۆدین و پێنتازۆسین و.

لەســـەرەتای بەکارهێنانـــدا تـــاك هەســـت بـــە خۆشـــی و چـــالاکی دەکـــات پاشـــان خاوبونـــەوەو کـــەمی بـــە ئاگـــایی و نـــەمانی شـــەهیەی خـــواردن و لاوازی سێکـــسی. دەشـــیٚ تـــاك بە ماوەی هەفتەیەك توشی ئالودەبوون ببیٚ.

دەشـــیٚ تـــاك توشـــی ژەهـــراوی بـــوون ببێـــی بـــەم مادانـــە بـــە برێکـــی کـــەم یـــان زۆر، گـــەر برەکـــە کـــەم بێـــت ئـــەوا دەبێتـــە هـــۆی دڵتێکـــەڵ هـــاتن و رشـــانەوە و کـــەم بونـــەوەی بـــە ئاگـــایی و کـــەمی هۆشـــپێدان و قـــەبزی و خورانـــدن و بیرچـــونەوەو ســـووربونەوە و تەســـکبونەوەی بیلبیلەی چاو.

گـــەر بـــە برێکـــی زۆر ژەهـــراوی بوبێـــت دەبێتـــە هـــۆی دابـــەزینی پەســـتانی خـــوێن و بورانەوەو کۆبونەوەی ئاو لە سیەکاندا و خەفەبونی هەناسەدان و فیٚ.

گـــەر بـــۆ ماوەیـــەکی درێـــژ بـــەکاربهێنریٚ دەبێتـــە هـــۆی لـــەرزۆکی پەلـــەکان و قـــەبزی و لاوازی جەستەیی و لاوازی سێکسی.

## نیشانەکانی لێگرتنەوە:

نیـــشانەکان پـــاش راگرتنـــی وەرگـــتن بـــە مـــاوەی ٨ -١٠ کـــاژێر دەســـت بـــە دەرکـــەوتن دەکـــەن و دەگەنـــە لوتکـــە لـــەماوەی ٤٨ -٧٢ کـــاژێر و دیارنـــامێنن لـــەماوەی ٧ – ١٠ رۆژدا.

گرنگترین نیشانەکانیش بریتین لە :

- فرمێسك هاتنە خوارەوەو لووت ئاوکردن.
- عەرەقکردنەوە.
- بێخەوی و بێئارامی.
- مووڕەقبوون.
- فراوانبوونی بیلبیلەی چاو.
- باوێشکدان.
- عەودالبوون بەشوێن دەرمانەکەدا.

چارەسەر بەتەواوی دەبێت لە ژێرچاودێری پزیشکدا بێت.

تێبـــینی: واباشـــترە تـــاك هـــەرگیز ئـــەم مادانـــە بەکارنـــەهێنێ و لێـــی نزیـــك نەبێتـــەوە، گـــەر لـــەو کەســـانە بـــوو کـــە ئـــەم مادانـــە بـــەکاردێنێت واباشـــترە هێـــروێن بـــە لـــەرێی دەرزیـــەوە بەکارنـــەهێنێت گـــەر لـــەو تاکانەیـــە کـــە بـــەم جـــۆرە بـــەکاری دێـــنێ پێویـــستە پەیرەوی ئەم خاڵانە بکات:

- پێویستە سرنجی تازە و پاکژ بەکاربێنێت.
- ئاوی پاڵێوراو بەکاربێنێت.
- هەرگیز دەرزی کەسانی تر بەکارنەهێنێت.
- شوێنی دەرزی لێدانەکە بکۆرێ وات هەموو کات لە هەمان شوێنی نەدەیت.
- هەرگیز مل یان بن ران یان مەمك بەکارهەمێنە وەك شوێنی دەرزی لێدان.
- هەرگیز لە شوێنێکی مەدە کە هەوکردن هەبێت.
- دڵنیابە لە تواندنەوەی مادەکە بە تەواوی پێش بەکارهێنانی.
- هەمیشە بە ئاراستەی خوێن دەرزی بەکاربێنە نەك بە ئاراستەی پێچەوانە.
- لەکاتی تەنهاییدا هێروێن بەکارمەهێنە.

## هەڵمژەکان

## Inhalants

لەم ساڵانەی دواییدا ئەم ڕێگەیە زۆر بەکاردەهێنرێت بە هۆی هەرزانی نرخ و بە ئاسان دەست کەوتن و نەبوونی ڕێگری لە بەدەست هێنانی و ئاسانی هەڵگرتن و بەکارهێنانی لە ماڵ و شوێنی کار.

نمونەی ئەم مادانە وەکو گازۆلین و سیکۆتین و بۆیاخ .... گرنگترین زیانی لاوەکی ئەم مادانە پوکانەوەی خانەکانی مێشکە و توشبوون بە خەلەفاندن. هیچ چارەسەرێکی وانیە بۆ ئەم حاڵەتە جگە لە ڕێگەگرتن لە بەردەوام بوون و چارەسەری دەرونی.

## دژە کۆلینێرجیك

## anticholinergics

وەکو ئەترۆپین و ئارتین و سکۆپۆلامین و بیلادۆنا و ... لە کاتی بەکارهێنانیدا هەست بە ئارامی و شادمانی دەکات و لە کات لێگرتنەوەدا هەست بە دڵەراوکێ و نارەحەتی و بێزاری و تورەیی دەکاو هەندێجار نیشانەکانی هەڵامەتی تیابەدەردەکەوێت.

لێرەدا پێویستە وەڵامی پرسیارێك بدەینەوە هەموو کۆکین کە ئەم مادانە زیانی زۆر و بکوژیان هەیە کەواتە هۆی بەکارهێنانی بۆ چی دەگەرێتەوە؟

دەتوانین کەلێك هۆکار ریزبەند بکەین لەمەر هۆکاری فێربوونی بەکارهێنانی ئەم مادانە گرنگترینیان :

- پەرومردەی خراپ و بێ ئاگایی باوان لە منداڵەکانیان.
- پەرتەوازە بوونی خێزان بەهۆی جیابونەوە ، تەلاق ، مردن.
- لاوازی سستمی پەرومردە.
- لاسایی کردنەوەی کەسانی لە خۆی گەورەتر کە پێشەنگن لەم کارەدا باوك، برا، هاورێی خراپ.

- خۆش گوزەرانی و نەزانینی سەرفکردنی پارە و ئارەزووی تاقیکردنەوە.
- بۆ چوونی هەڵە لەمەر پەیوەندی ئەم مادانە بە سێکسەوە.
- مجاملەکردنی کەسانی تر بۆ تاقیکردنەوە .
- بەکارهێنانەوەی دەرمانەکە بۆ ماوەیەکی درێژتر لەوەی پزیشك دەینوسێ .
- هەندێجار بەهۆی هەڵەی پزیشکەوە کە بۆ ماوەیەکی درێژتر لە پێویست دەرمانەکە دەداتە نەخۆش .
- بوونی پەشێویە دەرونیەکان وەکو خەمۆکی و سکیزۆفرینیا و دڵەراوکێ .... ئەگەری بەکارهێنان چوارهێندە زیاد دەکات.
- ڕاگەیاندن ، پیشاندانی ئەو کەسانە بە کەسێکی بە تواناو بەهەڵوێست.
- لاوازی هۆشیاری ئاینی و بێئاگایی لە حەرامی ئەم مادانە بەهۆی نەبوونی دەقێکی شەرعی روون کە باس لە حەرامی ئەم مادانە بکات.
- بەتاڵی و بێکاری و نەزانینی پڕکردنەوەی کاتەکان بە شتی بەسوود.
- پەنابردنە بەر ئەم مادانە لەکاتی بوونی فشار و کێشەی کۆمەڵایەتی بە ئومێدی رزگاربوون لەکاتێکدا هەموو کۆکین ئەم مادانە گرفتەکان ئاڵۆزتر دەکات.
- لاوازی دەزگاکان و بەرفراوانی سنوور و بوونی چەند وولاتێکی دراوسێ کە هەموویان بە دەست گرفتی ئالودەبونەوە دەناڵن و دوور نیە لەرێی دەزگا و باندەکانیانەوە بە فەرمی یان نا فەرمی هەوڵی بازاڕ پەیداکردن بدەن بۆ ژەهرەکانیان.
- هەرزانی نرخ بەئاسانی بەدەست کەوتن بەتایبەتی لە ناوچە سنوریەکان.

## هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر ئەلکحول و مادە هۆشبەرەکان

لێرە باسکردنی ئەم بابەتەم بەگرنگ زانی لەبەر ئەوەی رێژەیەکی زۆری خەڵکی کوردستان موسمانە و زۆر گرنگە بزانێت هەڵوێستی ئاینی ئیسلام بەرامبەر بەم مادانە چیە.

وەك ئاشکرایە ئاینی پیرۆزی ئیسلام دوو سەرچاوەی گرنگی هەیە بۆ یاسادانان سەرچاوەی یەکەم قورئانە و دووەمیش فەرمودەکانی پێغەمبەرە.( درودی خوای لەسەر

بێت ).

قورئـــان زۆر بەشـــێوەیەکی جـــوان و وورد بـــاس لـــە چـــۆنێتی چارەســـەرکردنی ئـــەم گرفتە دەکات بۆ ئەم مەبەستەش هەنگاوەکانی وازهێنان دەکات بە چوار قۆناغەوە.

قۆناغی یەکەم:

لـــەرێی پێـــشەنگی باشـــەوە و بـــەبێ ئـــەوەی ڕاســـتەوخۆ لـــە خرۆکـــی بابەتـــە بـــدات بۆیـــە دەفـــــەرموێ: ﴿ ﴾ (الأحـزاب: ). ئاشکراشـــــە کـــــە پێغەمبـــــەری خـــوا مـــەی نەخواردۆتـــەوە و حـــەزی بـــە بـــەکارهێنانی نـــەکردووە. لێـــرەدا قورئـــان ڕاســـتیەکی زانـــستی گـــرنگ دەخاتـــە روو ئـــەویش شـــوێن کـــەوتنی کەســـانی پێـــشەنگە واتـــە لاســـایی کردنـــەوەی کەســـانی تـــر لەکاتێکـــدا ئـــەو کەســـەت بـــە دڵ بێـــت. بۆیـــە پێغەمبـــەری خـــوا( درودی خـــوای لەســـەر بێـــت ) دەکاتـــە پێـــشەنگ و داوا لـــەموسمانان دەکـــات چـــاو لـــەو بکـــەن لـــە ڕەفتارەکانیانـــدا. دیـــارە تـــەنها بـــەم هـــەنگاوە کەســـانێك هـــەن وازدێـــنن لـــە کاتێکدا دەبینن پێشەنگەکەیان ناخواتەوە.

قۆناغی دووەم: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ﴾(البقرة: ٢١٩ ). لێرە قورئان باس لە زیانی خواردنەوە دەکات و لـە هـەمان کاتـدا دەڵـێ برێـك سودیشی هەیە بەڵام زیانەکانی لە سوودەکانی زیاترە ، ئەمە پەیامێکە بۆ ئەوانـەی دەیانـەوێ وازبێـنن هەر بەم قۆناغە برێکی بـاش لەوانـەی پـەیامی قورئـانی تێدەگـەن وازدێـنن خۆیـان لـە زیانـەکانی دەپارێزن. لێرەدا خوای میهرەبان ووشەی ( اثم ) بەکاردێنێ نەك ( ضرر ) چونکە زیانەکانی ئەلکحول تەنها جەستەیی نیە بەڵکو زیانی جەستەیی و دەرونی و کۆمەڵایەتی و مادی هەیە و سەرپێچیە لە فرمانی خـوای میهرەبان.

قۆناغی سێیەم :

لێـــرەدا بازنەکـــە لەســـەر موســـڵمان دەســـت دەکاتـــەوە لـــە ئایـــەتی ٤٣ ســـورەتی النـــساء دا دەفـــەرموێ ﴿لاتقربـــوا الـــصلاة وأنـــتم ســـكرى حتـــى تعلمـــوا مـــا تقولـــون﴾. لـــە هـــەمان کاتـــدا لـــە هـــەمان ســـورەتدا ئایـــەتی ١٠٣ دەفـــەرموێ ﴿إن الـــصلاة كانـــت علـــى المـــؤمنين كتابـــا موقوتـــا﴾، بۆیـــە تـــاکی بـــروا دار بـــواری خواردنـــەوەی زۆر تەســـك دەبێتـــەوە چـــونکە لـــە رۆژێکـــدا پێـــنج جـــار نوێـــژ دەکـــات و دەبـــێ نوێـــژەکان لـــە کـــاتی خۆیـــدا بکـــات و واباشـــترە بەکۆمـــەڵ بیکـــات و بـــەڵکو بـــۆ هەنـــدێ هـــەردەبێ بەکۆمـــەڵ بیکـــات ،کەواتـــە ئـــەو کاتـــە

نامینێتەوە بۆ تاك تاكو بخواتەوە.

بۆیــە ئیمــامی عومــەر دەســت بەرزدەكاتــەوە بــۆ پــەروەردگار و دەڵــێ: خوایــە گیــان سەبارەت بە خواردنەوە رێنماییەكی ئاشكرامان بكەیت.

**قۆناغی چوارەم:** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾ المائـدة: ٩٠ ) لــەم قۆناغــەدا بــە ئاشــكرا بــاس لــە حەرامی خواردنەوە دەكات هاوشانی دەكات لەگەڵ قومار و بت پەرستی و زاربازی.

ئەمــەش راڤــەی ئــەو دوو ئایەتــەی ســەرەوەیە بــە پــشت بەســتن بــە تەفــسیری ئاســانی مامۆســتا بورهــان محمــد ئــەمین ﴿ئــەی ئەوانــەی كــە باوەرتــان هێنــاوە دڵنیــابن كــە عــەرەق و قومــار و گۆشــتی مــاڵاتی ســەربراو بــۆ غــەیری خــوا لــەو شــوێنانەی كــە خــەڵك بــە پــیرۆزی دانــاوە نــەك ئیــسلام ، بــورج و حــەلال و حــەرام زانــین بــەهۆی هەڵــدانی زارەوە ئەمانــە هــەر پیــسن و لــەكارو كــردەوەی شــەیتانن، كەواتــە ئێــوەش خۆتــانی لــێ دووربگــرن و خۆتانی لێ بپارێزن، بۆ ئەوەی سەرفرازیی و بەختەوەریی بەدەست بێنن﴾.

بۆگەیــشتن بــەم قۆناغــە ١٥ ســاڵی خایانــد تــاوێ لــەرێی پێــشەنگی نمونەییــەوە كــە پێغەمبــەرە ( درودی خــوای لەســــەر بێــت ) تــاوێ لــەرێی بڵاوكردنــەوەی زانیــاری لەســەر زیانــەكانی خواردنــەوە و تــاوێكی تــر بــەئاگاهێنان لــە نەشــیاوی ئــەم كــارە لــە كــاتی نزیــك نوێژكردنــدا و نزیــك نەبونــەوە لــە نوێــژ بــە مەســتی و لــە دوا قۆناغــدا رێگــری تەواوەتی.

ســەبارەت بــە سەرچــاوەی دووەم كــە فــەرمودەكانی پێغەمبــەرە ( درودی خــوای لەســەر بێــت ) ئــەم چــەند فەرموودەیــە دەخەینــە روو: پێغەمبــەری ئــازیز دەفــەرموێ : ﴿كــل مــسكر خمــر، وكــل مــسكر حــرام﴾ ( أبــو داود وأحمــد ). واتــە هــەموو مەســتەرێك مەیــە و هەموو مەیەكیش حەرامە.

هــەروەها لــە فەرمودەیــەكی تــردا دەڵــێ: ﴿لعــن الله الخمــر شــاربها وســاقیها وبائعهــا، ومبتاعهــا ( مــشتریها )، وعاصــرها، ومعتقهــا، وحاملــها والمحمولــة إلیــه﴾( أبــو داود )، واتــە خــوا نەعلــەتی كــردووە لــە مــەی ، لــەوەی دەیخواتــەوە و ئــەوەی دەیگێــرێ و ئــەوەی دەیفرۆشــێ و ئــەوەی دەیكــرێ و ئــەوەی دەیگوشــێ ( واتــە دروســتی دەكــات ) و ...... ئــەوەی هــەڵی دەگــری ( واتــە دەیگوێزێتــەوە لــە شــوێنێكەوە بــۆ شــوێنێكی تــر ) و ئەوەشــی

بۆی دەبڕێ.

بەم فەرمودەیەی ئەبوداود دەردەکەوێ کە ئیسلام تاکو چ ئاستێك دژی ئەم کارە قێزەونەیە و نەعلەت لەسەرجەم ئەو کەسانە دەکات لەهەر ئاستێدا یان قۆناغێکدا هاوکاری دەکەن بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەم کارە.

ئەگەر جارێکی تر بگەڕێینەوە بۆ ئایەتەکەی پێشوو دەبینین هەردوو جار کەباسی مەی دەکری لەگەڵ قومماردا ناوی دەربڕێ و لەجاری دووەمدا هاوشان دەکرێ لەگەڵ قومار و بت پەرستی و زار بازی (هەڵدانی زار).

## بەشی نۆیەم:

## گرفتەکانی خەو

بێخەوی.

وەستانە هەناسە.

نارکۆلپسی.

زۆرخەوی.

نیشانەی بێئارامی ( بێ ئۆقرەیی ) لاق.

برۆکسیزم.

دیوەزمە ،مۆتەکە.

خەوی ترسناک.

ڕۆیشتن بەدەم خەوەوە.

قسەکردن بەدەم خەوەوە

# گرفتەکانی خەو

# Sleep disdorders

خەو بەشێکی گرنگی ژیانی تاك پێکدێنێ بۆ ئەوەی باس لە گرفت و نارەحەتیەکانی خەو بکەین وا پێویست دەکات لەسەرەتادا برێك باس لە خەو بکەین.

خەو نزیکەی یەك لە سێی ژیانی تاك پێکدێنێ بە پێی قۆناغەکانی ژیان پێویستی تاك بۆ خەو و ماوەی قۆناغەکانی خەو دەگۆڕێ.

خەو دەکرێت بە دوو قۆناغی سەرەکیەوە:

١- قۆناغی نەبوونی جوڵەی خێرای چاو: نزیکەی ٩٠ خولەك دەخایەنێ لە سەرەتای نوستنەوە.

٢- قۆناغی جوڵەی خێرای چاو: بەوە جیادەکرێتەوە کە چاو بەخێرایی دەجولێ.

### قۆناغی یەکەم دەکرێت بە چوار پلەوە:

پلەی یەکەم: نزیکەی لە ٢٪ - ٥٪ خەوی شەو پێك دێنێ و تاك لە نێوان خاوبونەوە و بەخەبەریدایە و زۆر بە ئاسانی بەخەبەر دێت و هەندێجار نکوڵی لەوە دەکات کە نوستبێ وەکو ئەوەی لە کاتی سەیرکردنی تەلەفزیۆندا بۆ چەند چرکەیەك یان خولەکێك خەو دەیباتەوە.

پلەی دووەم: نزیکەی لە ٤٥٪ - ٥٥٪ خەو پێك دێنێ و لەم قۆناغەشدا تاك بە ئاسانی بە ئاگادێتەوە لە کاتی بوونی دەنگە دەنگ.

پلەی سێیەم و چوارەم: کە پێیان دەڵێن خەوی شە پۆلی خاو یان لەسەرخۆ. نزیکەی لە ١٠٪ - ٢٣٪ خەو پێك دێنێ و لەم قۆناغەدا تاك بەئاسانی بەخەبەر نایەت و خەو قورس دەبێ و زیندەچالاکیەکانی لەش خاودەبنەوەو پلەی گەرمی لەش دادەبەزێ و شە پۆلەکانی دەلتا بەدەردەکەون و لە ٥٠٪ زیاتری لە قۆناغی چواردا دەبێ.

### قۆناغی دووەم (قۆناغی جوڵەی خێرای چاو):

ئەم قۆناغە نزیکەی لە ٢٠٪- ٢٥٪ خەو پێکدێنێ و قۆناغی خەوی قورسە و

ماسولکەکان لە باری پشودان بەڵام میشك زۆر چالاکە و بڕێکی زۆر خوێنی بۆ دەچێت و پلەی گەرمی مێشك بەرزدەبێتەوە. لەم قۆناغەدا تاك بەوە جیادەکرێتەوە ( جەستەیەکی ئیفلیج و مێشکێکی بە ئاگا ).

لەم قۆناغەدا ئاستی هۆرمۆنەکان دەگۆڕێ و کۆئەندامی زاوزێ بڕێکی زیاتر خوێنی بۆ دەچێت و لە مێینەدا قیتکە خوێنی زیاتر بۆ دەچێ و لە نێردا چوك ڕەپ دەبێت. لەماوەی هەشت کاژێر نوستندا ئەم دوو قۆناغە ٥ – ٦ جار دووبارە دەبێتەوە.

## چەند ڕاستیەك سەبارەت بە خەو:

١- منداڵی تازە لەدایك بوو ( کۆرپە ) پێویستی بە ١٧ -١٨ کاژێر نوستنە لە شەووڕۆژێکدا.

٢- لە تەمەنی ٦ مانگیدا ١٤ – ١٦ کاژێر لە شەووڕۆژێکدا.

٣- لە تەمەنی ٥ ساڵیدا نزیکەی ١٠ – ١٢ کاژێر لە شەووڕۆژێکدا.

٤- لە تەمەنی پێش هەرزەکاریدا نزیکەی ١٠ کاژێر.

٥- لە هەرزەکاریکدا نزیکەی ٩ کاژێر.

٦- لە لاویدا نزیکەی ٨ کاژێر.

٧- لە تەمنی پیریدا پلەی سێ و چواری خەو کە بەشێکن لە قۆناغی یەکەم و خەو تیایاندا قورسە زۆر کەم دەبێتەوە هەندێ دەڵێ نامێنێ ، بۆیە مرۆڤ لە پیریدا زۆر بە ئاسانی بە ئاگادێت کە دەنگێکی سوك ببیستێ لە کاتی خەودا و بەردەوام گلەیی لە گە نجەکان دەکات کە خەو قورسن.

٨- ئەو خەوانەی لە پلەی سێ و چواری قۆناغی یەکدا دەبینرێ بە تەواوی وەبیر نایەوە بەڵکو بەشێکیان بیردێنەوە ، هەندێجار هیچی بیرنایەتەوە.

٩- ئەو خەوانەی لە قۆناغی جوڵەی خێرای چاودا دەبینرێت بە تەواوی یان زوربەی وەبیردێنەوە .

١٠- لە کاتی خەودا مێشکی مرۆڤ بەردەوامە لە کارکردن و چالاکی.

١١- هەندێ نەخۆشی هەیە تەنها لەکاتی خەودا ڕوودەدات.

١٢- مرۆڤ لەکاتی خەودا بێتاوانە و پێنوسی لەسەر هەڵگیراوە، بۆیە ئازادە لەو

خەوانەی دەبینیٚ و لەو کارانەی دەیکات.

## گرفتەکانی خەو ( پەشیٚویەکانی خەو ):

## دەکریٚن بە دوو بەشەوە:

١- دسسۆمنیاس : ئەو گرفتانە دەگریٚتەوە کە پەیوەندی بە کات و بڕ و جۆری خەومەوە هەیە. وەکو:

- بیٚخەوی.
- وەستانە هەناسە.
- نارکۆلپسی.
- زۆرخەوی.
- نیشانەی بیٚئارامی ( بیٚ ئۆقرەیی ) لاق.

٢- پاراسۆمنیاس: بەوە جیادەکریٚنەوە کە ناتەواوی لە فسیۆلۆژی و ڕەفتاردا هەیە لەکاتی خەودا. وەکو:

- برۆکسیزم.
- دیوەزمە ،مۆتەکە.
- خەوی ترسناك.
- رۆیشتن بەدەم خەومەوە.
- قسەکردن بەدەم خەومەوە.

لیٚرە هەوڵ دەدەین بە کورتی سەبارەت بەو حاڵەتانەی سەرەوە بدویٚین.

# بێخەوی

# Insomnia

**دەتوانین بیخەوی پۆلین بکەین بۆ سێ جۆر:**

1- ئەوانەی بە گران خەویان لێدەکەوێت واتە شەوانە ماوەیەکی زۆر دەمێننەوە تاکو خەویان لێدەکەوێت.

2- ئەوانەی بە ئاسانی خەویان لێدەکەوێت بەلام بەیانیان زوو یان نیوەشەو بە ئاگا دێنەوەو ئیتر خەویان لێناکەوێتەوە.

3- ئەوانەی لە شەودا زوو زوو خەبەریان دەبێتەوە چێژ لە خەوەکانیان وەرناگرن.

**هەروەها بە پێی ماوەی بێخەویەکە دەتوانین پۆلینی بکەین بۆ سێ ئاست:**

1- بێخەوی کاتی : لە نێوان شەوێك بۆ سێ شەو.

2- بێخەوی ماوەکورت: لە نێوان ٤ شەو بۆ ٢١ شەو.

3- بێخەوی درێژخایەن: زیاتر لە ٢١ شەو.

گەلێك هۆکار هەن وا لە تاك دەکەن نەتوانێت خەوی لێبکەوێت یان لەکاتی نوستندا ماوەی پێویست بمێنێتەوە . گرنگترینیان بەکارهێنانی کافاینە لە قاوەو نیسکافەدا هەیە ، بەکارهێنانی ئەو دەرمانانەی وورووژێنەری کۆئەندامی دەمارە، پاش ئەوەی ماوەیەك دەرمانی هێورکەرەوە بەکاردێنی هەوڵی راگرتنی بدات، وەك نیشانەیەك لە نیشانەکانی لێگرتنەوە لە ئەلکحول و هەندێ لە مادەهۆشبەرەکان، نەخۆشی جەستەیی کە ئازاری هەبێت، بوونی پەشێویە دەروونیەکان وەکو پەشێویەکانی مەزاج ( خەمۆکی یان شادی ) و دڵەراوکێ و سکیزۆفرینیا، بوونی گرفتی کۆمەلایەتی یان ترس لە شتێك وەکو خۆئامادەکردنی خوێندکار بۆ تاقیکردنەوە یان ترس لە روودانی شتێك وەك سەرباز لە بەرەکانی جەنگدا یان قەرەباڵغی زۆر یان نەبوونی شوێنی پێویست بۆ حەوانەوە یان شوێنەکە پیس بێت.

**چارەسەر:**

زۆرگرنگە هۆکاری بێخەویەکە دیاری بکەین و چارەسەر لەسەر هەمان بنەما بێت. گەر هۆکارەکەی بونی نەخۆشیەکی جەستەیی بوو یان نەخۆشیەکی دەروونی

هەوڵ بدەین بە پێی حاڵەتەکە چارەسەری گونجاوی بۆ بکەین.

گەر بەهۆی بەکارهێنانی کافایین و دەرمانەوە بوو باشترین چارەسەر راگرتنیەتی. گەر بەهۆی گرفتی کۆمەڵایەتیەوە بوو هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی بە شێوەی گونجاو لەرێی رێنماییەوە. گەر بەهۆی ترسەوە بوو پشت بەستن بە راهێنانەکانی خۆخاوکردنەوە. دەتوانرێت بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دەرمانی دژەدڵەراوکی بەکاربهێنرێ بۆ چارەسەرکردنی بێخەوی بەڵام لە ژێر چاودێری پزیشك و بۆ ماوەیەکی کورت.

# وەستانی هەناسە لەکاتی خەودا

# Sleep apnea

وەك باسمان كرد لە كاتی نوستندا ماسولكەكانی لەش خاودەبنەوەو لەباری پشودانداا دەبن ئەم بارە ماسولكەكانی بۆری هەناسەش دەگریتەوە كە دەبێتە هۆی داخرانی رێرەوی هەناسە و بە ئاگابونەوە.ئەم حاڵەتە لەهەردوو رەگەزدا رودەدات و لە نێرینەدا برێك زیاترە، لەهەموو تەمەنێكدا روودەدات لە بەساڵاچواندا زیاترە .لە تاكی قەڵەودا زیاترە وەك لە لاواز و لەوانەی گرفتیان لە بۆری هەوادا یان لە قورقوراگەدا هەیە زیاترە لە كەسانی تر.

بۆ چارەسەری ئەم حاڵەتەش ئامێری فشاری موجەبی هەوا بەكاردەهێنرێ.

.

# برۆکسیزم ( لێکخشانی ددانەکان )

# Bruxism

یەکێکی ترە لە گرفتەکانی خەو بەهۆی گرژبوونی ماسولکەکانی جوینەوە ددانەکان لەسەریەك توند دەبن ولێك دەخشێن و بەمەش دەنگێکی ناخۆش دروست دەبێ لەکاتی خەودا کە دەوروبەر پێی بێتاقەت دەبن بەڵام کەسەکە خۆی بێئاگایە.

ئەم حاڵەتە زیاتر لە منداڵدا هەیە رێژەی بوونی نزیکەی لە ١٥٪ و سێ یەکیان حاڵەتەکەیان دەبێتە درێژخایەن. مەترسی ئەم حاڵەتە لەوەدایە تاك زیانی گەورە لە ددانەکانی دەکەوێ و پێویستە پزیشکی ددان قاڵبی تایبەتیان بۆ دروست بکات کە رێگر دەبێت لە زیان گەشتن بە ددانەکان و هەندێکیان لە رۆژدا هەست بە ئازاری شەویلاکەیان دەکەن بەهۆی گرژبوونی لە شەودا لەم بارەدا چارەسەری پێویستی بۆ دەکرێت.

# زۆرخەوی

## Hypersomnia

تاك لایەنی كەم ماوەی مانگێك ئەم حالەتەی دەبێت كە شەوانە بری پێویست دەنوێ هەندێجار زیاتر لە پێویستیش (٨-١٢ كاژێر) بەلام بە رۆژ زۆر خەوی دێت ، ئەم زۆر خەویە كار دەكاتە سەر توانای كاركردن و پەیوەندی كۆمەلایەتی. پەیوەندی بە بوونی نەخۆشی جەستەیی یان دەرونیەوە نیەو هۆكارەكەی بۆ بەكارهێنانی ئەلكحول و مادە هۆشبەرەكان ناگەرێتەوە.

زۆرجار بەیانیان ناتوانێت لەخەو هەلسێت و لە كاروپیشەی دوادەكەوێت. بەرۆژ ماوەی كاژێری یان زیاتر دەنوێ بەلام پاش لە خەو هەلسان هەست بە گورج بونەوە ناكات و بەردەوام خەوالووە.

# ڕۆیشتن بەدەم خەوەوە

# Sleep walking

نزیکەی لە ١٨٪ ی منداڵان ئەم حاڵەتەیان هەیە و لە نێرینەدا زیاترە وەك لە مێینە و لە منداڵدا زیاترە وەك لە گەورە، گەر منداڵ ئەم حاڵەتەی هەبێت تا تەمەنی ٩ ساڵان زۆربەیان لە گەڵیاندا بەردەوام دەبێت تا لاوێتی.

ئەم حاڵەتە لە سێیەکی یەکەمی شەودا ڕوودەدات و بەوە جیادەکرێتەوە کە بە زەحمەت بە ئاگادێتەوە و هەندێجار دەتوانێت خۆی لە هەندێ شت بپارێزێ وەك شتی تیژ یان زیان گەیاندن بە خۆ لەهەندێ باردا تاك پاش گەڕان دەگەڕێتەوە سەر جێگاکەی خۆی و بۆ ڕۆژی دوایی هیچی بە بیر نایەت. لەهەندێ باردا تاك زیان بە خۆی دەگەیەنێت ڕەنگە بەرشتێکی تیژ بکەوێت یان بکەوێتە خوارەوە یان بەدەم خەوەوە ئۆتۆمۆبیل لێبخورێت و زیان بە خۆی کەسانی تر بگەیەنێت.

چارەسەر:

پاراستنی سەلامەتی ( سەیفتی ) تاك زۆرگرنگە لەو ڕوومەی ژووری نوستنەکەی لە نهۆمی سەرەوە نەبێت و سویچی ئۆتۆمبیلەکەی لای خۆی نەبێت شەوانە و پەنجەرەی ژوورەکەی کەتیبەی هەبێت. پزیشك دەتوانێت بە پێی توندی حاڵەتەکە دەرمانی بۆ دابێت و زۆربەیان چاکدەبنەوە.

## ئاخاوتن بەدەم خەوەوە:

## Sleep talking

نزیکـــەی لـــە ٥٪ گـــەورە و لـــە ٥٠٪ ی منـــدالآن ئـــەم حالەتـــەیان هەیـــە و زۆرجـــار قـــسەکانی تێناگـــەیت و دەربرینـــی دەم چـــاو هاوشـــێوەی قـــسەکان نیـــە یـــان هـــیچ دەربرینێـــك نییـــە (واتـــە دەشـــێ قـــسەکان خـــۆش یـــا نـــاخۆش بـــن بـــەلآم سـیمای ئـــەو کەســـە هیچ ئاماژەیەکی تیا نیە).

زۆرجـــار پێویـــستی بـــە چارەســـەر نیـــە و پـــاش ماوەیـــەك تـــاك چـــاکدەبێتەوە و گـــەر حاڵەتەکـــە بـــەردەوام بـــوو کـــە زۆرکـــات هاوســـەر یـــان هـــاوەڵی نـــەخۆش گرفتـــی دەبێـــت لـــە حاڵەتەکـــە چـــونکە تـــاك خـــۆی بـــیری نایـــەت چـــی روویـــداوە لـــەم حاڵەتـــەدا چارەســـەری پێویستی بۆ دەکرێت لە رێی پزیشکەوە.

دەشـــێ هەنـــدێجار هاوســـەری ئـــەو کەســـە لـــە قـــسەکانی نـــەخۆش گومـــان پەیـــدا بکـــات و کێـــشەی خێزانـــی لێبکەوێتـــەوە بۆیـــە زۆرگرنگـــە سروشـــتی نەخۆشـــیەکە بـــۆ هاوســـەرەکە و بۆ نەخۆشەکەش باس بکرێت.

# خەوی بەزۆر

# Narcolepsy

لــە هــەموو ١٠٠,٠٠ كــەس نزیكــەی ٢٠ كــەس ( لــە هەنــدێ توێژینــەوەدا نزیكــەی ١٩٠ كەس ) ئەم حاڵەتەیان هەیە.

یەكــەم جــار لــە لایــەن زانــا جیلینیــۆ لــە ســاڵی ١٨٨٠ وەســفی ئــەم حاڵەتــە كــراوە. بــەوە جیادەكرێتــە تــاك پاڵنــەرێكی گــەورەی خــەو بەســەریدا زاڵ دەبێــت بــەبێ گــوێ دانــە گونجــاوی یــان نــەگونجاوی شــوێنەكەو ناتوانێــت بــەرەنگاری بێتــەوەو خــەوی لێدەكــەوێت، لەوانەیــە لــە هــۆڵی وانــە خوێندنــدا یــان لــە رێ و بــانی گــشتی یــان لــە كــاتی لێخوڕینی ئوتۆمۆبیل بێت.

ئــەم حاڵەتــە كاریگــەری ڕاســتەوخۆی نیــە لەســەر ئاســتی زیرەكــی تــاك بــەڵام گــەلێ گرفــت بــۆ تــاك دروســت دەكــات و دەوروبــەر زۆرجــار وەكــو كەســێكی تەمــەڵ و خــەواڵو و دەروانن تاكی نەخۆش.

هــۆی روودانــی ئــەم حاڵەتــە بــۆ كــەمی ئاســتی مــادەی ئۆركــسین ( هیپــۆكریتین ) دەگەڕێتە لە كۆئەندامی دەماردا.

لــەم حاڵەتــەدا تــاك ماســولكەكانی خاودەبنــەوە و ناتوانێــت خــۆی راگــرێ و ناچــاردەبێت بنــوێ بــۆ مــاوەی چــەند خولــەكێ تــا كــازێرێ و پاشــان بــە ئاگــا دێتــەوە و هەســت بــە چــالاكی دەكــات.واتــە تــاك بــە قۆناغــە ئاســاییەكانی خــەودا تێنا پــەڕێ بــەڵكو ڕاستەوخۆ دەچێتە قۆناغی جوڵەی خێرای چاو كە قۆناغی خەو بینینە.

چارەسەر:

رێنمــایی تــاك بــەوەی خــشتەیەكی دیــاریكراوی هــەبێت بــۆ نوســتن واتــە كــاتی نوســتنی شــەوان و هەســتانی بــەیانی دیــاری كــراو بێــت ، هــەروەها گــەر بــوار هــەبوو خــەوی كــورت بــۆ مــاوەی ١٠ -١٥ خولــەك لــە رۆژدا گــەر شــوێنەكە گونجــا بــوو هــەركاتێ هەســتی كرد خەوی دێت.

بــەكارهێنانی دەرمــان بــە تایبــەتی گروپــی ئەمفیتامینــەكان لــە ژێرچــاودێری پزیــشكدا چــونكە ئــەم دەرمانانــە مەترســی ئــالودەبونی هەیــە.هــەروەها دەتوانرێــت ســوود

# نیشانەی بێ ئۆقرەیی پەلەکان

## Restless legs syndrome

تــاك هەســت بــە نارەحــەتی و بێئــارامی دەکــات لــە پەلەکانیــدا بــە تایبــەتی پەلــەکانی خــوارەوە بەتایبــەتی لــە ســەرەتای نوســتندا ، حــەز بــەوە دەکــات پەلــەکانی خــوارەوەی ( لاقــەکانی ) بجولێنێــت و هەنــدێجار بــەوەش ئــارامی نایــەت و ناچــاردەبێ هەستێ و بە ژوورەکەدا بگەرێت.

تــاك هەســت بــەوە دەکــات شــتێك بەســەر پێیــدا دەروات یــان هەســت بــە مێرولــەکردن دەکات یان ئازارێکی زۆر کە وەسف ناکرێ یان ئازمویەکی نە پساو بۆ لاق جولاندن.

نزیکــەی لــە ٣٠٪ حاڵەتــەکان کاریگــەری بۆماوەیــان لەســەرەو نەگــەری رووادانــی ئــەم حاڵەتــەش لــە نێــوان ئەوانــەی یــەکێك یــان زیــاتر لــەم نەخۆشــیانەیان هەیــە زیــاترە بــەلام بــوونی نیــشانەی بــێ ئــۆقرەیی پەلــەکان مانــای بــوونی یــەکێك لــەم نەخۆشــیانە نیە.

- کەم خوێنی کە هۆکەی کەمی مادەی ئاسن بێت.
- نەخۆشی شەکرە.
- پەککەوتنی گورچیلە.
- تەسکبونەوەو رەقبوونی خوێنبەرەکانی لاق.
- ئالوودەبوون بە ئەلکحول.
- هــەروەها رێــژەی توشــبوون لــە مــاوەی سکپری ( دووگیــانی ) دا زیــاترە وەك لــە کــاتی ئاسایی.

تێبــینی : دەبێــت ئــەم حاڵەتــەمان لێتێکــەڵ نــەبێت لەگــەڵ حاڵــەتی جولــەی ناوبــەناوی پەلــەکان (periodic limb movement) کــە لــە کــاتی خــەودا روودەدات و مــاوەی کــەمتر لــە پێــنج چــرکە دەخایەنێــت و هــەر ٢٠ – ٤٠ چــرکە جارێــك روودەدات و زوربــەی کــات پەنــجە گــەورەی پــێ دەجولێــت و جومگــەی قولــە پێ و ئــەژنۆ لــە بــاری نوشــتاندنەوەدا دەبێــت. ئــەم حاڵەتــە زۆرجــار لەگــەڵ نیــشانەی بــێ ئــۆقرەیی پەلەکاندا روودەدات.

# دێوەزمە یان مۆتەکە  و خەوی ترسناک

# Nightmares and Sleep terror

هەریەکە لە ئێمە لەکاتی نوستندا چەندە جار خەو دەبینێت هەندێ لەو خەوانە خۆشن و هەندێکی تر ناخۆش و ترسناکن. بەشێوەیەکی زانستیانە دەتوانین خەوبینین بکەین بە دوو جۆرەوە بە پێی روودانیان لە قۆناغەکانی خەو:

خەوی ترسناک : ئەم جۆرە خەوانە لە پلەی سێ و چواری قۆناغی نەبونی جوڵەی خێرای چاودا روودەدات. لە سێیەکی یەکەمی خەودا روودەدات و تاک لە خەوێکی قولەوە بەئاگادێتەوە و هەست بە ترسێکی زۆر دەکات و دڵی خێرا لێدەدات و توشی هەناسە کورتی ( هەناسە تەنگی ) دەبێت و خەوەکەی بیر نایەتەوە یان تەنها برێکی زۆرکەمی بیردێتەوە.

دێوەزمە : ئەم جۆرە خەوانە لە قۆناغی جوڵەی خێرای چاودا روودەدات و تاک بەتەوای یان زوربەی خەوەکەی بیردێتەوە و لە سێیەکی کۆتای خەودا روودەدات.

هەردوو حاڵەت زیاتر لە منداڵدا روودەدات و زۆرگرنگە باوان ترسی خەوەکە لای منداڵ کەم بکەنەوە و بە شێوەیەکی دروست ڕەفتار لەگەڵ منداڵەکەدا بکەن.

لەگەورەشدا زۆرجار هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی فشاری دەرونی و رووداوی ناخۆش زۆرگرنگە گەر حاڵەتەکە تاکی بێزار کردبوو سەردانی پزیشکی دەرونی بکات و لە خۆیەوە دەرمان بەکارنەهێنێت.

## هەندێ ڕێنمایی بۆ خەوێکی دروست:

١- جگەی خەو تەنها بۆ خەوتن و سێکسە بۆیە تەنها کاتێک بچۆرە سەر جێگە کە بە نیازی یەکێك لەو دوانە یان هەردوکیانت هەبێت.

٢- گەر خەوت نەهات لە جێگەدا مەمێنەرەوە بەڵکو برۆ خۆت بە خوێندنەوە یان هەر شتێکی ترەوە سەرقاڵ بکە. یان لەسەر پشت پاڵکەوەو رۆژنامەیەك یان کتێبێك بخۆێنەرەوە تاکو خەواڵو دەبیت.

٣- لەسەر دەم مەنو چونکە لە رووی زانستیەوە زیانی هەیەو لەرووی ئاینیشەوە کارێکی باش نیە.

٤- وەرزش بۆ هەموان گرنگە و ئەوانەی وەرزش دەکەن باشتر دەنون لە کەسانی تر بەلام پێویستە وەرزش ٣ -٤ کاژێر پێش نوستن بکرێت نەك نزیکە و کاتی نوستن.

٥- پلەی گەرمی ژووری نوستن کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر نوستن وا باشە ژوورەکەت زۆر گەرم نەبێت یان زۆر سارد نەبێ چونکە گەرمی زۆر خەوەکەت بچربچر دەکات و ساردی زۆریش ئازاری ماسولکەکانت دروست دەکات.

٦- رووناکی واباشترە ژووری نوستن رووناکی زۆر نەبێت یان گەر روناکیش بوو روناکیەکە رومو چاوی تاکی نوستوو نەبێت.

٧- نەکێشانی جگەرە چونکە دەبێتە هۆی خەوی بچر بچر.

٨- خواردن:

- نەخواردنی خواردنی قورس پێش خەوتن.
- خواردنی برێکی کەم خواردن پێش نوستن رەنگە هاوکاری نوستننت بکات.
- نەخواردنەوەی چا ، قاوە ، نسکافە پێش نوستن.

٩- پاك وخاوێنی: خۆشتن بە کاژێرێ یان دووان پێش نوستن پاکوخاوێنی پۆشاکەکان و بۆنی خۆش و پۆشاکی فراوان و قوماشی نەرم هاوکاریت دەکات بۆ خەوێکی باشتر.

١٠- بیرت نەجێ هەندێ زیکری تایەت بە پێش خەو هەن زۆرگرنگن و گور کەسێکی باوەرداریت هەست بە ئارامی شادیەکی زۆر دەکەیت بە خوێندنیان ، سەرەڕای پاداشتی خوایی بۆ ئەم کارەت.

# گرفتەکانی خواردن

## Eating disorders

خـــواردن یەکێکـــە لـــە پێویـــستیە ســـەرەیەکانی ژیـــان و کـــەس نیـــە خـــواردن نـــەخوات ، بـــەڵام هەنـــدێك بەتایبـــەتی هـــەرزەکاران خـــۆ لـــەخواردن دەگرنـــەوە بەمەبەســـتی خـــۆلاوازکردن لـــە کاتێکـــدا دەشـــێ کێـــشی لەشـــیان نـــەك زۆر نـــەبێت بـــەڵکو کـــەمیش بێـــت ، هەنـــدێکی تـــر بـــە شـــێوەیەکی دڕندانـــە دەخـــوات پـــاش خـــواردن تـــەواو کـــردن ڕەنگـــە پێویستی بە یەکێك بێت بۆ هەستانە سەرپێ.

لێـــرەدا کۆمەڵـــە پرســـیارێك هەیـــە زۆر گرنگـــە کـــە وەڵامیـــان بدەینەوە، هـــەر هەموویان لە دەوری بابەتێك دەگەرێ پسیارەکانیش ئەمانەن.

کێشی دروستی تاك دەبێت چەند بێت ؟

کێ بە قەڵەو دادەنرێت ؟

کێ لاوازە ( واتە کێشی کەمە )؟

ئایا هەموو قەڵەوێ وەك یەك وایە؟

بـــۆ وەڵامـــی ئـــەم پرســـیارانە پەرتوکـــە زانـــستیەکان بـــە پێـــی هاوکێـــشەیەك بریـــار لەسەر ئەوە دەدەن ، ئەویش هاوکێشەی ڕێژەی بارستایی لەشە.

$$\frac{\text{کێشی لەش بە کیلۆگرام}}{\text{بەرزی بالاّ بە مەتر دووجا}} = \text{ڕێژەی بارستایی لەش.}$$

### خشتەی ڕێژەی بارستای لەش

Body mass index

| | ڕەگەز | | ڕاڤەکردن |
|---|---|---|---|
| | مێ | نێر | |
| ١ | کەمتر لە ١٩,١ | کەمتر لە ٢٠,٧ | لاواز واتە کێشی کەمە. |
| ٢ | ١٩,١- ٢٥,٨ | ٢٠,٧- ٢٦,٤ | کێشی نمونەیی واتە دروست. |
| ٣ | ٢٥,٩- ٢٧,٣ | ٢٦,٥- ٢٧,٨ | لە قەراغ کێش زۆریدایە. |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٤ | ٢٧,٤ - ٣٢,٢ | ٢٧,٩ - ٣١,١ | كێشی زۆره. |
| ٥ | ٣٢,٣ - ٤٤,٨ | ٣١,٢ - ٤٥,٤ | زۆر كێشی زۆره واته قەڵەوه. |
| ٦ | زیاتر له ٤٤,٨ | زیاتر له ٤٥,٤ | قەڵەویەكی مەترسیدار واته حاڵەتی قەلەوی نەخۆشیه. |

## تێبینی :

ئەم خشتەیه بۆ منداڵ و هەرزەكار و ژنی دووگیان«سكپر» و كەسێك تەمەنی لەسەرو ٦٥ ساڵیەوه بێت بەكار نایەت.

## گرنگترین گرفتەكانی خواردن :

١- نەخواردنی دەماری.

٢- فرەخواردنی دەماری.

# نەخواردنی دەماری

# Anorexia nervosa

بریکــی بەچــاو لــە هــەرزەکاران بــە تایبــەتی کــچان لــە جەســتەی خۆیــان ڕازی نــین زۆرجــار حەزبــەوە دەکــەن کێــشیان کــەم بێــت لەبــەر هۆیــەك یــان هۆیــەکی تــر. بۆیــە پــەیرەوی ســستمێکی خــواردنی تایبــەت دەکــەن بــۆ دابەزانــدی کــێش لەکاتێکــدا دەشــێ کێشی لەشیان نەك زۆر نەبێت بەڵکو لە خوار ئاساییەوە بێت.

دەست نیشانکردن :

١- ترسی بەردەوام لە قەڵەوی کە بەدابەزاندی کێش ئەو ترسە کەم ناکات.

٢- دابەزانــدی کــێش بــۆ کــەمتر لــە ١٥٪ ی کێــشی گونجــاو بــۆ ئــەو تاکــە بــە پێی تەمــەن و بالا.

٣- روونەدانی سێ سوری مانگانە بەدوای یەکدا.

٤- بــەوە جیادەکرێنــەوە کــە چــالاکیان زۆرە و خــۆ مانوودەکــەن بــە ئامــادەکرنی خــۆراك بــەڵام لــەکاتی خواردنــدا کــەم دەخــۆن و نکــوڵی لــەوە دەکــەن کــە برســیان بێــت زیــاتر بایەخ بە خوێندن دەدەن.

٥- دەکــرێن بــە دوو گروپــەوە ، گروپــی یەکــەم خــواردن کــەم دەخــۆن بــۆ دابەزانــدی کــێش واتــە خۆیــان دەپــارێزن لــە چــەوری و شــرینیەکان ، گروپــی دووەم خــواردن زۆردەخــۆن بــە تایبــەتی لــە ئاهــەنگ و بۆنەکانــدا پــاش بــە ڕێگــەی دروســت یــان نادروســت کێــشی خۆیــان دادەبــەزێنن ﴿ ڕێگــەی دروســت وەك وەرزش کــردن ، نادروست وەکو خۆ رشاندنەوە ، بەکارهێنانی حەبی سکچوون ، حۆقنەکردن﴾.

٦- بــەهۆی ئــەم ســتمی نەخواردنــەوە یــان خــواردن و بەهەڵــە دابەزانــدی کــێش تــاك توشی گەلێ گرفت دەبێ:

- کلۆربوونی ددانەکان.
- کۆئەنــدامی ســوڕان: دابــەزینی فــشاری خــوێن، تێکــچونی لێــدانی دڵ، کەمبونــەوەی لێــدانی دڵ، بــچوکبونەوەی قــەبارەی دڵ، بــچوکبونەوەی ســکۆڵەی چــە پی دڵ و گرفت لە زمانەی دوانی دڵدا.

- کۆئەندامی هەرس: درەنگ بە تالبونەوەی گەدە، پوکانەوەی گەدە، قەبزی.
- کوێرە رژێنەکان و زیندەچالاکیی:
  - دواکەوتنی بالغ بوون.
  - وەستانی گەشە.
  - نەمانی سووری مانگانە.
  - پوکانەوەی مەمك.
  - دابەزینی پلەی گەرمە لەش.
  - کەمی ئاستی سۆدیۆم، پۆتاسیۆم، شەکر.
  - گۆڕانکاری لە کاری رژێنی پەریزادە ﴿غودەی دەرەقی﴾.
- گورچیلە: بەردی گورچیلە.
- پێست: وشکبونی پێست، لاوازی موو و روتانەوەی قژ، بوونی مووی لاوازی هاوشێوەی مووی کۆرپەی تازە لەدایك بوو.
- کۆئەندامی دەمار: پوکانەوەی هەندێ خانەی مێشك کە ناودەبرێ بە دروزنە پوکانەوە پاش گەرانەوە بۆ خواردن ئەو خانانە دەگەرێنەوە ئاستی جارانیان، نەخۆشی لە چێوە دەمارەکاندا.
- خوێن: کەم خوێنی، کەمبونەوەی خرۆکە سپیەکان.
- پوکانەوەی ئێسك و ماسولکەکان.

### هۆکاری ئەم حاڵەتە:

١- هۆکاری سایکۆداینەمیکی: هەندێ لە زانایان وای بۆ دەچن هۆکاری ئەم نەخۆشیە بگەرێتەوە بۆ ترس لە پەیوەندی سێکسی و منداڵبوون بۆیە لە تەمەنی هەرزەکاریدا سەرهەڵدەدات و تاك بەوەی خواردن ناخوات خۆی دەپارێزێ لە بالغ بوون و کاری سێکسی و منداڵ بوون.

٢- هۆکاری رەفتاری: هەندێ زانای تر هۆکارەکە دەگەرێننەوە بۆ بوونی پەیوەندی سلبی لە نێوان خواردن و کێشی لەش، تاك لەو باوەرەدایە تاکە هۆکاری قەڵەوی زۆر خۆریە و تاك لە مێشکی خۆیدا رقی لە خواردن دەبێتەوە هەست بە دڵتێکەڵ هاتن و قێزکردنەوە لە خواردن دەکات. ئەمەش وای لێدەکات خواردن

نەخوات و ژیانی خۆی وا رابێنێ کە خواردن گرنگ نیە و پرسی نابێت.

٣- کێشەی خێزانی : زانایان تێبینیان کردووە لەوانەی ئەم حاڵەتەیان هەیە ڕێژەیەکی زۆریان کێشەی خێزانیان هەیە و لە خێزاندا گەلێ کێشە و گرفت هەیە چارەسەر نەکراوە بۆیە منداڵ یان هەرزەکار بەم ڕەفتاری سەرنجی خێزان ڕادەکێشێت بۆ بابەتێکی تر دوور لە کێشە سەرەکیەکە.

٤- بۆماوە: تێبینی کراوە لە نێوان دوانەی یەك زەردێنەدا( ٦٥٪ ) زیاترە وەك لە دوانەی دوو زەردێنە( ٣٢٪ ).

٥- هۆکاری کاریگەر و فشار: تێبینی کراوە سەرەتای سەرهەڵدانی ئەم حاڵەتە لە زۆربەی کاتەکاندا پەیوەندی هەیە بە بوونی فشار وەکو لەدەست دان ( مردنی یەکێك لە ئەندامانی خێزان ) ، بونی نەخۆشیەکی مەترسیدار لە خێزاندا، سەرنەکەوتن لە کاردا یان لە خوێندندا.

٦- ڕاگەیاندن: یەکێکی تر لە هۆکارە گرنگەکان ڕاگەیاندنە لە ڕێی نمایشکەرانی پۆشاکەوە و هەندێ لە ئەستێرەکانی ڕاگەیاندن و ئەکتەرەکان و گۆران بێژەکان کە کێشی لەشیان زۆر کەمە و دەچێتە قاڵبی پەشێویە دەرونیەکان بەلام لە ڕاگەیاندا وا نیشان دەدرێ کە زۆر جوانە و سەرنج ڕاکێشە ئەمەش وا لە هەرزەکار دەکات سستمێکی خواردنی توند لەسەر خۆی دابنێ بۆ دابەزاندنی کێش تاکو وەکو ئەوانی لێبێت.

## ڕێژەی بونی حاڵەکە :

هەندێ توێژینەوە باس ١/ ٢٠٠ کەس دەکات و هەندێ توێژینەوەی تازە باس لە ١٪ دەکات و ئەگەری بونی حاڵەتەکە لە مێینەدا ٥ – ١٥ ئەوەندەی نێرە. زیاترە لە تەمەنی هەرزەکاریدا سەرهەڵدەدات.

## چارەسەر:

خەواندنی نەخۆش لە نەخۆشخانە گەر پێویستی کرد.

پەیرەوکردنی سستەمێکی خواردنی گونجاو تاکو تاك دەست دەکاتەوە بە خواردن گەر خواردن نەخوات پێویستە سۆندەی گەدەی بۆ دابنرێت.

بەکارهێنانی دەرمانی دژەخەمۆکی.

چارەسەری دەرونی لە رێی چارەسەری تاکەکەسی و خێزانی.

## ئایندەی نەخۆش

گەر چارەسەر نەکرێت نزیکەی لە (١٠٪ - ١٥٪) یان دەمرن. گەر چارەسەری گونجاوی بۆ بکرێت ئایندەیان بە پێی سستەمی سێ یەك دەبێت ( واتە سێ یەکیان بە تەواوی چاکدەبنەوە ، سێ یەکی تریان نیمچە چاکبونەوە ، و ئەوی تریان دەبێتە حاڵەتێکی درێژخایەن ) .

## ئەو فاکتەرانەی ئایندەی تاك خراپ دەکەن:

- گەر حاڵەتەکە درێژخایەن بێت.
- گەر حاڵەتەکە لە تەمەنێکی درەنگتردا دەربکەوێت.
- هاوشان بێت لەگەڵ نیشانەی بولیمیا( واتە خۆی برشێنێتەوە یان دەرمانی رەوانی بەکاربێنێت ).
- دڵەراوکێ کاتێك لەگەڵ کەسانی تردا خواردن بخوات.
- برێکی زۆر کێشی لەشی لە دەست دابێت.
- لاوازی پەیوەندی باوان یان بوونی کێشە لەو پەیوەندیەدا.
- رەگەزی نێر.

## تێبینی:

١- زۆر گرنگە بۆ کەسوکاری نەخۆش و پزیشك پەلە نەکەن لەوەی برێکی زۆر خواردن بدەنە نەخۆش بەڵکو دەبێت بە پێی سستمێکی راست و زانستیانە وورده وورده بڕی خۆراکەکە زیاد بکرێت چونکە وەك لە پێشەوە باسمان کرد ئەم کەسانە دڵیان بچوك دەبێتەوەو لاواز دەبێت و زیندەچالاکیەکانی لەشیان خاودەبێت بۆیە گەر برێکی زۆر خواردنیان بدرێتێ دەشێ دڵیان توانای کاری پێویستی نەبێت توشی گەلێ گرفتی نوێ ببن.

٢- زۆر گرنگە بۆ پزیشك و کەسوکاری نەخۆش بزانن کە خەواندنی نەخۆش لە نەخۆشخانە جۆرێك نیە لە سزا بەڵکو بەشێکە لە چارەسەر و دەبێ ئەم راستیە بگەیەننە نەخۆش.

٣- ئـەم حاڵەتـە وەك سـەرجەم حاڵەتـە دەرونیـەکانی تـر بـە هـیچ جـۆرێ بـە هەڕەشـەو لێدان چارەسەر ناکرێ.

## فرەخواردنی دەماری

ئـەم حاڵەتـە بـەوە جیادەکرێتـە ناوبـەناو تـاك کـۆنترۆڵی خـۆی بـۆ نـاکرێ و برێکـی زۆر خـواردن دەخـوات ، لەهـەمان کاتـدا بایـەخێکی زۆر دەداتـە شـێوەی نمونـەی جەستەی.

ئـەم حاڵەتـە لـە ١٪ - ١,٥٪ مێینـەدا روودەدات زیـاتر لەتەمـەنی هەرزەکاریـدا. تـاك زوربـەی کـات بـیری لای خواردنـە ،کـە خـواردن دەبینـی خـۆی پێنـاگیرێ و برێکـی زۆر دەخـوات و پاشـان بـۆ رێگـرتن لـە زیـادبوونی کێـشی لەشـی پـەنا دەباتـە بـەر خـۆ رشـاندنەوە ، بـەکارهێنانی حـەبی رەوانـی ، نـان نـەخواردن بـۆ ماوەیـەك، بـەکارهێنانی دەرمانی کەمکەرەوەی شەهیە.

### نیشانەکان و ماکەکان:

- دەشێ هاوشێوەی نەخواردنی دەماری بێت بەلام برێك توندی کەمترە.
- مردنی کوتوپر بەهۆی پەککەوتنی دڵەوە.
- تێکـچونی ئاسـتی ئایۆنـەکانی لـەش.( کەمبونـەوەی ئاسـتی پۆتاسـیوم، سـۆدیۆم، کلۆر).
- دڕانی گەدە یان سورێنچك.
- برینی گەدە یان ریخۆڵە.
- بونی چەوری لە پیساییدا.
- کلۆربوونی ددانەکان.

### چارەسەر:

- لـە زوربـەی حاڵەتەکانـدا لـە دەرەوەی نەخۆشـخانە( کلینیکـەکان ) چارەسـەر دەکرێـت لـە هەنـدێ حاڵـەتی تایبەتـدا پێویـست بـە خەوانـدن دەکـات لـە نەخۆشخانە وەکو ترسی خۆکوژی ، کێشەی جەستەیی.

- بەکارهێنانی دەرمان حەبی فلوکستین بە بڕێکی زۆر بۆ ماوەی زیاتر لە ساڵێک.
- چەرەسەری دەرونی لە رێی چارەسەری مەعریفی و سلوکی.

**ئایندەی نەخۆش:**

**بەشێوەیەکی گشتی باشە و چاکدەبنەوە.**

# بەشی یانزەیەم:

## پەشێویە دەرونیەکان لە منداڵدا

## ئۆتیزم

## پەشێوی کەمی هۆشپێدان و فرەجولەیی

## بیرکۆڵی

## خۆتەرکردن

## دەستدرێژی بۆ سەر منداڵ

# پەشێویە دەروونیەکان لە منداڵدا

# Child Mental Disorders

یـونگ دەڵـێ: گـەر شـتێ هـەبێ لەمنداڵـدا و ئـارەزوی گـۆرینی بکـەین وا باشـترە بگەرێین بەشوێنیدا بزانین وا باشتر نیە ئەو شتە لەخۆماندا بگۆرین.

زۆربـەی ئـەو نەخۆشـیانەی لـە گـەورەدا روودەدەن بـە هـەمان شـێوە لـە منداڵیـشدا روودەدەن بە تایبەتی پەشێویەکانی مەزاج و دڵەراوکێ.

لـەم بەشـەدا مەبەسـتمان ئـەوە نیـە بـاس لـەو پەشـێویانە بکـەین کـە بێگومـان گرنگـی خـۆی هەیـە و نیـشانەکانی برێـك جیـاوازە لـە نیـشانەکانی هـەمان پەشـێوی لـە گـەورەدا. بـەڵکو هـەوڵ دەدەیـن بـاس لـە هەنـدێ بابـەت بکـەین کـە زیـاتر تایبەتـە بـە منـداڵان ،ئـەویش حالـەتی ئـۆتیزم ، پەشـێوی فرەجولـەیی و کـەمی هۆشـپێدان ، بیرکۆڵی، خراپ رەفتارکردن لەگەڵ منداڵدا هەندێ بابەتی تر.

# ئۆتیزم ( خود تەنهایی )

# Autism

ئـــۆتیزم وشـــەیەکی یۆنانیـــە بـــەمانای دابـــڕان وگۆشـــەگیری دێـــت. بـــۆ یەکـــەم جـــار لەلایەن لیۆکەنەر ئەم زاراوەیە بەکارهێنرا.

ئـــۆتیزم بریتیـــە لـــە تێکـــچوونێکی ئـــاڵۆزی گەشـــە کـــە لـــە ســـێ ســـاڵی یەکـــەمی تەمـــەنی منداڵدا ڕوودەدات لە ئە نجامی تێکچوونی فرمانەکانی مێشك ودەمار.

ئـــۆتیزم توشـــی هـــەژارو دەوڵەمەنـــد ، ڕەش پێـــست و ســـپی پێـــست ، بـــاکور و باشـــور دەبـــێ بـــەبێ جیـــاوازی. ڕێـــژەی توشـــبوون نزیکـــەی ٣- ٤ منداڵـــە لەهـــەر ١٠,٠٠٠ منـــداڵ و لـــە نێردا زیاترە وەك لە مێ بەڕێژەی ١/٣ .

### هۆکاری ئۆتیزم :

١- بۆمـــاوە: هەرچـــەندە تـــاکو ئێـــستا ڕۆڵـــی بـــۆ مـــاوە بـــە ڕونـــی ئاشـــکرا نیـــە بـــەڵام زیـــاتر لـــە ئاماژەیـــەك هەیـــە لەســـەر کاریگـــەری بۆمـــاوە لـــە ئـــۆتیزم دا بـــۆ نمونـــە گـــەر یـــەکێك لـــە دوانـــە ئـــۆتیزمی هـــەبێت ئەگـــەری ئـــەوەی منـــداڵی دووەم توشـــبێت ٥٠٪ یـــە. گـــەر خێزانێـــك منـــداڵێکیان هـــەبێ حاڵـــەتی ئـــۆیتزمی هـــەبێ ئەگـــەری حاڵـــەتی دووەم لەنێوانیاندا ٥٠ هێندەی خێزانەکانی ترە.

٢- هەوکردنـــە ڤـــایرۆســـیەکان: زیـــاتر لـــە هـــەوکردنێکی ڤـــایرەســـی هەیـــە کـــە توشـــی دایکـــی دووگیـــان یـــان کۆرپـــەی ســـاوادەبێت لـــە ســـەرەتای ژیانیـــدا دەشـــێ ببێتـــە هـــۆی ســـەرهەڵدانی ئـــۆتیزم وەکـــو ســـیرۆژەی ئـــەڵمانی ، هەوکردنـــە ڤـــایرەســـیەکانی مێشك، ... هتد.

٣- ئاســـتی وەرگرەکـــانی مێـــشك: بەرزبونـــەوەی ئاســـتی ســـیرۆتۆنین و دۆپـــامین وئیپنفـــرین ونـــۆرئیپنفرین لـــەکاتی پێـــدانی چارەســـەر بـــۆ دابەزانـــدنی ئاســـتی ئـــەم وەرگرانە هەندێك لە نیشانەکان باشتر دەبن بەتایبەتی فرەجوڵەیی.

### نیشانەکانی :

لـــە دوای تەمـــەنی ١,٥ ســـاڵیەوە نیـــشانەکان بەدەردەکـــەون بـــەزۆری لـــە نێـــوان تەمەنی ٢-٣ ساڵی. زیاتر گرفتەکان لە سێ بواردا ڕوودەدات:

أ- گفتوگۆ ( ئاخاوتن ).

ب- پەیوەندی کۆمەڵایەتی .

ت- گرفت لە بواری ڕەفتاردا ( هەڵسوکەوت ).

٤- دووبارەکردنەوەی هەمان یاری چەند جار و چەند جار بەبێ ماندوو بوون و نەبوونی توانای داهێنان لە یاریەکاندا .

٥- بەرەنگاربونەوەی گۆڕانکاری لە یاریەکاندا و زووهەڵچوون وەکو خواردن لە دەفرێکی دیاری کراودا یان لەبەرکردنی پۆشاکێکی دیاریکراو ڕازی نەبون بە گۆڕینی.

٦- دابڕانی کۆمەڵایەتی و ڕازی نەبونی یاری کردن لەگەڵ خێزان و منداڵانی تر.

٧- خاوخلیچکی یان جوڵەی بەردەوامی بێ مەبەست.

٨- گوێ نەدان بەدەوروبەر زۆرجار دەگاتە ئاستێك کەسوکار وادەزانن منداڵەکەیان کەڕبووە.

٩- لەڕووی زمانەوە: دواکەوتنی ئاخاوتن ، بێدەنگی یان دەنگەدەنگی بەردەوام ، دووبارەکردنەوەی قسەی ئەوانی تر بەبێ تێگەیشتن لە ماناکەی، وتنی وشەو ڕستەی بێ واتا، پێچەوانەکردنەوەی ئامرازەکان، گرفت لە ناونانی شتەکاندا.

١٠- پێکەنینی بێ هۆ.

١١- لاوازی یان نەبوونی هۆشیێدان و چاونەبرینە چاوی بەرامبەر .

١٢- تێنەگەشتن لە زمانی جەستەو گرفت لە بابەتە بینراوەکاندا.

١٣- دواکەوتنی گەشەی هەستەکان ( بۆنکردن ، بەرکەوتن، تامکردن ).

١٤- هەست نەکردن بە سەرماو گەرما یان ڕاستر بێئاگایی لە سەرما وگەرما.

١٥- ترسان لە هەندێ شت کە پێویست بە ترس ناکات و نەترسان لە هەندێکی تر کە جێی مەترسیە، وەکو ترسان لە دەنگی ئاژەڵ یان فرۆکە و نەترسان لە ڕاکردن بە سەرشەقامدا کاتێك ئۆتۆمۆبیل هاتوچۆ دەکات.

١٦- دووبارەکردنەوەی هەمان ڕەفتار ، یاری کردن بەدەست و پەلەکان و کێشان بەسەردا و نوشتاندنەوەی پەلەکان بەشێوەیکی ترسناك.

ئـۆتیزم سـەر بەکۆمـەڵێك یـان شـە پەنگێك نەخۆشـیە کـە کـرێن بـە پێـنج جۆرەوە:

١- ئۆتیزم ( خود تەنهایە ). ﴿لیۆ کەنەر ١٩٤٣﴾

٢- پەشێوی ریتز. ﴿هانز ئەسپەرگەر ١٩٤٤﴾

٣- پەشێوی ئەسپرجەر. ﴿ئەدریا ریت ١٩٦٦﴾

٤- پەشێوی تێکشکانی منداڵی. ﴿سیۆدۆ هیلەر ١٩٠٨﴾

٥- پەشێوی گەشەی گشتی دیاری نەکراو.

## پۆلێنکردنی ئۆتیزم:

بە پێی کۆلمان دەکرێت بە سێ جۆرەوە:

١- ئۆتیزکی کلاسیکی

٢- ئۆتیزم لەگەڵ سکیزۆفرینیا.

٣- ئۆتیزم لەگەل گرفتە دەمارییەکان.

## پۆلین کردنی ستیڤن و کوی و ڤی و ماتسن:

١- ئۆتیزمی نائاسایی.

٢- ئۆتیزمی سانا.

٣- ئۆتیزمی مامناوەند.

٤- ئۆتیزمی توند.

## وەڵامی چەند پرسیارێك :

١- ئایا منداڵانی ئۆتیزم لەرووی زیرەکیەوە دواکەتوترن لەمنداڵانی تر؟

وەك دەزانـین زیرەکـی پێویـستی بـە توانـای وەرگـتن هەیـە لـە دەورویـەروە لـە رێـی هەسـتەکان، منـداڵی ئـۆتیزم توانـای پەیوەنـدی لەگـەڵ دەورویـەردا دەپـچرێ و لـە دونیایـەکی تایبەتـدا دەژی لـە سـەرەتای تەمەنیـەوە، بۆیـە شـتێکی ئاسـاییە کـە ئاسـتی زیرەکیـان کـەمتر بێـت لەمنـداڵانی تـر بـە پێـی توێژینـەوەکان ئامـاژە بـەوە دەدەن کـە ئاستی زیرەکیان کەمترە لە منداڵانی تر بە نزیکەی ٥٠٪.

٢- ئایا دایك باوك بەرپرسن لە توشبونی منداڵەکەیان بە ئۆتیزم؟

بــەهیچ جۆرێــك. جــاران لــەو بــاوەڕەبوون شــێوازی پــەروەردەکردنی بــاوان بــۆ منداڵەکــەیان کاریگــەری گــەورەی هەیــە لــە توشــبوون بــە ئــۆتیزم بــەڵام ئــە نجامی ئــەو توێژینەوانــەی لەســەر منــداڵ و خێزانــی ئــۆتیزم کــراون هــیچ پەیوەندیــەکیان بــەدی نەکردووە لە نێوان شێوازی پەروەردەو نەگەری توشبون بە ئۆتیزم.

تەنانــەت هەنــدێ بۆچــونی پێــشتر باســیان لــەوە دەکــرد گــەر دایــك لــە پەیوەنــدی لەگــەڵ منداڵەکەیــدا ســارد بێــت مەترســی توشــبوون بــە ئــۆتیزم زیــاترە ﴿ بــەو دایکانــەیان دەوت دایکــی یەخــچاڵ﴾ ، گومــانی تێــدا نیــە کــە شــێوازی پــەروەردەکردن کاریگــەری گــەورەی هەیــە لەســەر ئاینــدەی تــاك و شــێوازی هەڵــسوکەوتی بــەڵام نابێتــە هۆکارێــك بــۆ توشــبوون بــە ئــۆتیزم. هەنــدێکی تــر لــەو بــاوەڕەدا بــوون گــەر بــاوان نەخۆشــی دەرونیــان هــەبێ منداڵــەکانیان نەگــەری توشــبونیان بــە ئــۆتیزم زیــاترە وەك لە منداڵانی تر سەبارەت بەم بۆچونەش هیچ توێژینەوەیەك نیە ئاماژە بەمە بدات.

٣- ئایا منداڵانی ئۆتیزم توانای تایبەتیان هەیە؟

بــەڵێ ڕێژەیــەکی کــەمیان توانــای تایبــەتیان هەیــە وەك ئــەوەی دەتوانێــت پارچــە مۆســیقایەك بــژەنێ پــاش ئــەوەی تــەنها یــەکجار گــوێ بیــستی بــێ، یــان دەتوانێــت وێنەیــەکی ســەرنج ڕاکــێش بکێــشێت ، یــان بابــەتێکی بیرکاریانــەی ئــاڵۆز شــیبکاتەوە کــە کەسانی تر بەدەستیەوە دادەمێنن بەڵام دەشێ نەتوانێت بابەتێکی سادە شیبکاتەوە.

٤- ئایا چاو کاریگەری هەیە لەسەر توشبون بە ئۆتیزم؟

ڕەنگــە زۆر کــەس تێبــینی ئــەوەی کردبــێ برێکــی بەرچــاوی منــداڵانی ئــۆتیزم روخــسارو ســیمایەکی جوانیــان هەیــە بــەڵام ئەمــە مانــای ئــەوە نیــە کــەبوون بــە چــاوەوە هۆکارێــك بێــت بــۆ توشــبوون بــەم نەخۆشــیە پێویــست ناکــات نــاوی کــەس بــسوتێنی بــەبیاوی ئــەوەی چــاویان پیــسە یــان پەیوەنــدی کۆمەڵایــەتی خــۆت تێــك بــدەیت لەگــەڵ کەسانی تردا لەژێر ئەو بیانوەدا.

٥- ئایا لەڕێی شێخ و مەلاکانەوە چارەسەر دەکرێت؟

وەك دەزانــین لــەڕۆژگاری ئــەمڕۆدا کەســانێك پەیــدابوون بازرگــانی بــە ئیــسلامەوە دەکــەن لایــەنی ســۆزداری خێزانــەکان بــەلای خۆیانــدا ڕادەکێــشن لــەژێر نــاوی جیاجیــادا بــەناوی ئــەوەی نەخۆشــیە درێژخایەنــەکان چــاك دەکەنــەوە . بۆیــە دوور نیــە هــەیانبێت

لــه پلانــی ئــەوەدا بێــت برێــك پــارە لــه خێزانــانی ئــۆتیزم بکێـشێتەوە بــەناوی ئــەوەی هــەموو نەخۆشــییەك چارەســەر(یــان چارەشــەر) دەكــات ئــەوەی جێــی وتنــە تــاكو ئێــستا هــیچ شــێخ یــان مەلایــەك باســی لــەوە نــەكردووە تــەنها یــەك منــداڵی چــاك كردبێتــەوە لــە كاتێكــدا لــە وولاتێكــی وەك عەرەبــستانی ســعوییەدا زیــاتر لــه ٦٠,٠٠٠ (شەســت هــەزار) منــداڵی ئــۆتیزم هەیــە. بــەلام بــە دووری نــازانم لــە وولاتــی خۆمانــدا هەنــدێ لەوانــەی دینارداری دەكەن بەناوی دینداریی‌یەوە برێك پارەش لە خێزانانی ئۆتیزم بكێشنەوە.

٦- ئایا كوتان دەبێتە هۆی ئۆتیزم؟

مــاوەیكی زۆر لــە ئــەوروپا و ئەمــەریكا خێزانــەكان بــە شــوێن هیوایەكــدا دەگــەڕان تــاكو هۆكــاری ئــۆتیزم بــزانن و هەنــدێ رۆژنامــە هۆكارەكــەی دەگەرانــدەوە بــۆ كوتــانی ســیانی بــەلام توێژینــەوەكانی تایلــەر و هاورێكــانی ئــەوە روون دەكاتــەوە بــەهیچ جۆرێــك پەیوەندی نیە لە نێوان كوتانی سیانی و ئۆتیزم دا.

٧- پەیوەندی خواردن بە ئۆتیزمەوە چیە؟

زۆر لــە ئێمــە لــەكاتی بــوونی هــەر نەخۆشــیەكدا پرســیار لــە پزیــشك دەكــەن ئایــا هــیچ خۆراكێــك هەیــە هۆكــاری ســەرهەڵدانی ئــەم حاڵەتــە بێــت یــان هــیچ خۆراكێــك هەیــە كــە تــاك نــە یخوات بــۆ ئــەوەی چــاك ببێتــەوە . ســەبارەت بــە پەیوەنــدی نێــوان خــۆراك و ئــۆتیزم زۆر توێژینــەوە كــراوە و زیــاتر لــە بۆچــونێك هەیــە ئەمانــەی خــوارەوە هــەرە بــۆ چــونە گرنــك و راســتەكانن . بــەلام ئــەم رێنماییانــە دەبێــت لــە ژێــر چــاودێری پزیــشكدا بێــت بــۆ ماوەیــەكی دیــاری كــراو كــە لــە چــەند هەفتەیــەك تێنا پــەرێ و بــە پێــی ســوود وەرگرتنی منداڵەكە بریاری بەردەوام بوون یان راگرتنی ئەم سیستەمە دەدرێت.

أ- لابردنی مادەی كازین كە لە شیردا هەیە.

ب- لابردنی مادەی گلوتین كە لە گەنم ، جۆ ، گەنمە شامیدا هەیە.

ت- بــەكارهێنانی رۆنــی كــەتان و رۆنــی جگــەری ماســی ئــەو خواردنانــەی ئۆمیگــا ٣ یــان ئۆمیگا شەشی هەیە.

بــــەكارهێنانی هەنــــدێ ڤیتــــامین ئــــەی ، بــــی ١، ٣، ١٢،٦،٥ و زنــــك و مەگنیــــسیۆم و كالیسیۆم بە برێكی گونجاو.

بــە پێی مــانوەلی دەستنیــشانكردن و پــۆلێن كردنــی پەشــێویە دەرونیــەكان منــداڵ

دەبێت لایەنی کەم شەش نیشانەی لەمانەی خوارەوە هەبێت دوو نیشانە لە گروپی A و یەك نیشانە لە هەریەك لە C و D بەڵام دەبێت کۆی گشتی بکاتە شەش.

| | نیشانەکان | بەڵێ | نەخێر | نازانم |
|---|---|---|---|---|
| A | لاوازی لە چەندێتی و چۆنێتی هەڵوێستی کۆمەڵایەتی | | | |
| 1 | ئایا گرفتی دەربڕینەکانی دەم چاو ، باری جەستە ، وەڵام نەدانەوەی سۆزی بەرامبەر پێکەنینی یان تورەبوونی دایکی هەیە؟ | | | |
| 2 | ئایا گرفتی هەیە لە دروست کردنی پەیوەندی لەگەڵ هاوتەمەنەکانیدا؟ | | | |
| 3 | ئایا کەمی بایەخدان وهەوڵدانی هەیە لە بەشداریکردن لە یاریدا ( نەتوانینی هێنانی یاریەك یان داواکردنی یان نیشارەتکردن بۆ یاریەکە )؟ | | | |
| 4 | ئایا کەمی یان نەتوانینی گۆڕینەوەی هەست وسۆزی هەیە لەگەڵ چواردەوردا ؟ | | | |
| B | لاوازی لە چەندێتی و چۆنێتی پەیوەندی کردن و بەردەوام بوون | | | |
| 5 | ئایا دواکەوتن یان لاوازی توانای گفتوگۆی ( نەتوانینی جێگرتنەوەی بە بەکارهێنانی شێوازێکی تر ) هەیە؟ | | | |
| 6 | ئایا لە حاڵەتی تێزانینی قسەکردندا ناتوانێت دەستپێشخەری بکات و بەردەوام بێت لە گفتوگۆ؟ | | | |
| 7 | ئایا دووبارەکردنەوەی هەمان ووشە یان ڕستەی ( دەشێ زمانی تایبەت بێ بە خۆی ) هەیە؟ | | | |
| 8 | ئایا گرفتی هەیە لە گۆڕانکاری لە یارێەکان و لە ئاسایی کردنەوەی کەسانی تر و گرفت لە یاری کردن لەگەڵ هاوەڵەکانیدا ؟ | | | |
| C | بایەخدان چالاکی دووبارە | | | |
| 9 | ئایا خۆماندووکردن بەیاریەکی دیاری کراوە یان یاریکردن بە یاریەك بەشێوەیەکی زۆر سنووردار و | | | |

| ژ | پرسیار | | | |
|---|---|---|---|---|
| | ئاسروشتی و جەختکردنەوە لەسەر چەندبارەکردنەوەی هەیە؟. | | | |
| 10 | ئایا بەرەنگاربونەوەی گۆڕانکاری لە یاری و کەلوپەلی تایبەتی خۆی قاپ وقاچاخ هەیە؟ | | | |
| 11 | ئایا چەندبارەکردنەوەی جوڵەی لەش بەتایبەتی پەلەکان ، ماندوو و وەرس نەبوون لەو کارەی هەیە؟. | | | |
| 12 | ئایا سووربوون لەسەر بایەخدان بە بەشێکی بچوکی ئەو یاریەی هەیە؟. | | | |
| کۆی گشتی: .................... | | | | |

## چارەسەر:

ئۆتیزم لەو نەخۆشیانە نیە بە تەنها ڕێگەیەك چارەسەر بکرێت بەڵکو لە منداڵێکەوە بۆ منداڵێکی تر ڕێگە چارەکان جیاوازە و زۆرجار زیاتر لەڕێگە چارەیەکمان پێویست دەبێت.

١- گۆڕینی یان باشترکردنی ڕەفتار.

٢- ڕێگەی بنیادنانی فێرکاری.

٣- دەرمان.

ئەگەر منداڵ ڕەفتاری دووبارەو شەرەنگێزی زۆر بێت و گرفت بۆ ئەندامانی خێزان و دەوروبەر دروست بکات دەتوانین دەرمانی دژە سایکۆس بەکاربێنین ، گەر ڕەفتاری دووبارەو شەرەنگێزی و زوو هەڵچونی هەبێت دەرمانەکانی دژە خەمۆکی کاریگەریان زیاترە ، گەر کەمی هۆشپێدانی هەبێت حەبی ریتالین یان هاوشێوەکانی ئەو بەکاردەهێنرێت.هەندێ پێکهاتەی روەکی هەن لە لایەن هەندێ کۆمپانیای دەرمانەوە دروستکراون تا رادەیەك کاریگەریان هەیە بۆ کەمکردنەوەی هەڵچون و شەرەنگێزی.

١- چارەسەری ئاخاوتن.

